ناوی کتێب: خۆشەویستی لەگەڵ تەمەن گەورەدەبێ

بابەت: شیعر

نووسینی: ئیسماعیل محەمەد خدر حەیدەری (ئاودێر)

تیراژ: ٥٠٠دانە

چاپخانە: منارە ـ هەولێر(٠٧٥٠٣٨٥١٦١١)

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە سپاردنی (٥٥) ساڵی ٢٠١٥ ی دراوەتێ.

پێشکەشە بە:

- دایکی جگەرگۆشەکانم و هاوسەرە پاکیزەکەم..
- بە هەموو ئەوینداران..

# پێشەکی

چاپکردنی بەرهەمی ئەدەبی بۆ ئاودێری شاعیر ڕەنگە درەنگ وەخت بێ، بەراورد بە ماوەی کارکردنی بێ پسانەوەی لەم بوارەدا .. لەوانەیە ئەمەش برێکی پەیوەندیی بە بیروبۆچوونی خۆیەوە هەبووبێ.. ئێستاش کە کۆمەڵێك بەرهەمی بەپێزی لە دوو توێی ئەم بەرگەدا پێشکەش بە شەیدایانی شیعر دەکات، مژدەیەکی خۆشە، چونکە ئاودێر شاعیری پەیڤی ناسك و شیعری پاراوە..

پێموایە شاعیریەتی ئاودێر پەیوەندیی بە پەروەردەی بنەماڵەی حەیدەرییانەوە هەبێ، چونکە زوو بە کتێب و ئەدەب و سیاسەت ئاشنابووە، بۆ خۆشی خولیای ئەو هەموو بزاوتانەی تێدا هەبووە..

هەناسەی شیعری خەفتاکان لە سنگی ئاودێردا گەڕاوە، وەك زۆربەی شاعیرانی ئەو سەردەمە شیعری ستوونی و شیعری ئازادی نووسیوە، لە پاڵ زمانی سانای شیعری، بەدوای وشەی تازە و ڕەسەن گەڕاوە و لە شیعرەکانیدا تەوزیفی کردوون.. ئاودێر لە زۆربواردا ئەسپی شیعریی خۆی تاوداوە و لە هەموو بوارەکانیشدا شیعری بەرزی هەیە، بەڵام بەڕای من لە شیعرە دڵدارییەکانیدا تا قوڵایی دڵ ڕۆیشتووە.

ئەو شیعرانەی لێرەدا بڵاوکراونەتەوە سەرجەمی بەرهەمەکانی شاعیر نین، گوڵبژێرێکی هەمەڕەنگن بۆ ئەوەی لەم ژوانەدا تینوێتی خوێنەرانی خۆی پێ بشکێنێ، ئەوەی لە پەیامی ئاودێردا هەستی پێدەکەین، پەیامێکە لە ناخی شاعیر بە ڕاستگۆیی و بێ زۆرلەخۆکردن هەڵقوڵاوە..

ئاودێر لە بزاڤی ڕۆشنبیریی شەقلاوە وەك خەمخۆرێك بوونێکی بەرچاوی هەیە، ئەندامی لقی هەولێری یەکێتی نووسەرانی کوردە و لە دامەزراندنی کۆمەڵەی ڕۆشنبیرانی پێشکەوتنخوازی شەقلاوە، ڕۆڵێکی کارای هەبووە و لەیەکەم دەستەی کارگێڕیدا بۆ ماوەی دووساڵ ئەرکی جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی لە ئەستۆ گرتووە و ئەندامی دەستەی نووسەرانی بڵاوکراوەی (شالوور) بووە، کە وەك مانگانەیەکی ڕۆشنبیری لەلایەن کۆمەڵەوە دەردەچوو.

وەك وەفایەك کۆمەڵەی ڕۆشنبیرانی پێشکەوتنخوازی شەقلاوە بە سوپاسەوە زنجیرەی یەکەمی کتێبی بڵاوکراوەکانی خۆی پێبەخشی، بەو هیوایەی شوێنێکی شیاو لە کتێبخانەی کوردی بگرێت و وەك بەرهەمێکی بەپێز بچێتە سەر خەرمانی شیعری کوردی..

سەرباز مەجید خۆشناو

٢٠١٥/١/١٦

## ئەوین بۆ خــوا

٢٠١٢/٢/١٥

ئەوینـداری تیشـک و شـەوقی ڕوخــساری تـۆم یـارەکەم
خۆشەویسـتیی وبــەزەت هــێزە بۆبـــرەوی کــارەکـــەم

خــورپەی دڵ وهەناسەکــەم لــە دۆزی دوو قـامـکتدان
ڕاســتە ڕێــیان گــەرنەفەرمووی زۆرئەستەمە چارەکەم

لــەبوونم خۆشەویسـتری ئــارامییت خــەڵات کــردووم
گەرلەخۆتم جـوێ کەیتەوە بێ کــەسە هــاوارە کـــەم

بەچــاو نەمــدیوی گــیانەکەم جــارێک، لە خەودا نەبێ
لەجوولەو هەست وخوێنمدای ڕێک دەخەی ڕەفتارەکەم

ئەمن لــەسەر وادەو ژوانــێک ڕووم کــردۆتە ماڵــێکت
بەدیدارێــک بــەدیی بێــنن خــەونە پڕ گــوڵزارە کەم

بیـرو ئەندێشـە پەی نـابەن دەلالییـت بـەرجــەستەکەن
لە هەمـوو جـوانێ جـوانتری جـوانە جــوان کردارەکــەم

ڕووی گـــرژینەوەت کــردۆتە نیشـتمانی ســـووتماکم
بۆیـــە بــەرەو بـاڵا بـوونە نـێرگـــزی بەهـــارەکــەم

کوردەواریی چاولەڕێگەی بەخشینی نەبڕاوەتە
بە بارانی مەیلی گەرمت گەرمە گوندوشارەکەم

ئەوینت داگیری کردووم بەناخ و جەستە مەوە
خۆم دەکەم وەگەردی ئاخی زێدە مەینەتبارەکەم.

واڕاهاتووم لەتۆ زێتر باکم لەهیچ کەس نەبێ
تۆش بەدلۆڤانییتەوە مەمدە دەس نەیارەکەم

کێوی قەندیلی سوپاسم بەندەیی رانان دەکا..
دەروون یەکلای کردۆتەوە تۆی پەروەردگارەکەم

بەخۆشحاڵیی دەتپەرستم بۆئەوە ئەفراندمت
خۆشترین هەستە کە دەبمە ئاویتەی دڵدارەکەم

ژین وناڵین وکۆتاییم فەرمانی پێشوەختەتە
لەچاوی بەد بمپارێزە تاقانە بێدارەکەم

خەڵقەندەیەکی پاکیزە کردوومی بەبەردەی خۆی
ئەدی چۆن دێتە پێوانە توانای کردگارەکەم!

## گۆرانییەکی خەمناک[1]

نالەی زەیتوون

بەسەر پشتی

حەسەن بەسری و دەنگارە دا

شێخسورەحمانی بێدار کرد

پۆستە هێنەری شەرمەزار

هاتن و لە دارنمرەوە

یەک بۆ سیمۆن و کریکۆر

دووەم بۆ کانی خومان و

ناوەنجی و ئاوی بێترمە

دەچوون بە غار ... !

نامەی مەرگ .. دانە دانە

بەبێ ماوە و لە دەرکە دان

[1] لە ژمارە (٢) ی ساڵی ٢٠٠١ ی بڵاوکراوەی شالوور بڵاوکراوەتەوە .

بێ جیاوازیی ئیسلام و دیان

خۆی کوتایە ناو ماڵەکان ... !

رەشیان بەشەقڵاوە پۆشی

شالوورانی شێخ بایز و دەرماناوە

کانی مزگەفت و شێخ سەید

ئاواز لە بینەقاقەیان بووە گرێ و

هیچ نەخەوتن .

پۆلێ ئەستێرەی ئاسمانی سەفینیان رشت

کۆمەڵێ پیاوی بەرچاوی

ئێرەیان کوشت !.

هێرشی لەشکری خەمە

دایکی شەهید

گەردشی دەگمەن و کەمە

دایکی شەهید ..

## هیوای کچۆڵەی پێشمەرگە[٢]

١٩٨٧/١٢/٢٦

دایە . . دایە

کە لە بازێڕ گەڕایتەوە

بووکە شووشەم بۆ مەهێنە

چیدی گۆمیلکەی سەرنجم

بە هەڵبەزین و ئاکاری منالانە

مەشڵەقێنە . .

پێنووس و پەڕاوێکی پاک

تۆپێک ڕیس و

شیشکەی چنینم بۆ بێنە . .

لە هەنگاونان بەرەو خۆرو

کاری ڕەنگینم ڕابێنە . .

[٢] لەژمارە (٣) ی ساڵی ٢٠٠٢ ی بڵاوکراوەی شالوور بڵاوکراوەتەوە

چونکە دایە . . ئەم بەهارە

بابە لەکاروان دێتەوە

ڕەنگە دەیان قۆناغی هیوابەخشتر

ببڕێ و جارێ نەسێتەوە . . .

حەزم لێ یە . . پووزەوانەی

دەستکردی خۆمی پێشکەش کەم

بەقامکە وردیلەکانم

کەزی و قژی پەرێشانی

داستانی پڕ لەسەروەریی بنوێنمەوە . .

گەوهەر و مەرجانی ووشەی فەرهەنگەکان

بۆ سروودی پێشڤەچوونی . . بهۆنمەوە

لەمەکتەب و لە کۆڵانا

بۆ هاوتەمەنەکانی خۆم

بەسەربەرزیی پڕ بە گەرووم بیخوێنمەوە

## دڵ لە دڵ دان [٣]

گەردرەختی

خەونە ڕەنگ پەمەییەکانت

تەڕبووبەسووکە ئاونگی شەرمی تەمەن

دەبیە خۆراکی هەژدیهای پێچاوپێچی

برسیی زەمەن...!

خافڵاندن ومانگرتنی پەریی ئیلهام

لەهەمبەرئادەمی گەورەی جوان پەرستیی

یاخیی بوونە لە ئەزەل و

سۆز دەربڕین!..

پەناگیریی و گزی لەدەروون کردنە

حاشا بکەیت لەچێژی تەزووی لاوێتیی و

شادیی کرین!

---

[٣] شالوور : ژ/٦ ٢٠٠٤ لا ٣

(لەتەنیایی شەوی ژینا مەنێ هەنگاوی

کوێرانە)

ئەوە سۆمای چەمی ماندووی گوزەرانم

گوڵە ستێرەی باریکەڕێی حەزەکانتەو

جڵەوکێشی هەرمانتانە!

ئەوە قوڵپەی کانیاوی بەینەتی دڵێ

ئسماعیلی گوێڕایەڵ و مل بەرکێردی

فەرمانتانە !

ئەوە گوڵڕێزی هەڵبەستم

ئەوە شەودێزی بێدار و زیندوو هەستم

ئەوە تریفەی ڕوومەتی چەندین کەڕەت

مارانگەستم

تێشووی هەگبەی سەفەرتانە!

مێر منالْ . . . گەرفامی ئەکرد

لەیەک ئاڵانی دوو ڕەشمار

پشکۆی چ گڕە حەزێکی تامەزرۆیە

ژەهرە مەرگی لەهێکەوەی نە ئەباراند!.

خۆی بوە مارو ئاڵا لە مار

ئەنگوست گەستنەوەی لەحەیفی

مارکوژییا

چ بەرێکی بایەخ هەوێنی پێوەیە!

خۆ .. پەشیمانیی و حەیرانی خۆزگەو بریا

لە دوای هەر دەستوەشیێکی زەق و گەورە

شەوچەرەی کۆڕی ئێمەیە!

کابانی هۆنراوە چنم :

من وەک دەنگ و ڕەفتاری تۆ

نەرم و لەسەرخۆو هێمنم!

زەریام خۆشەویست

وەک نێرگزی گەشی چیمەنی نزارت

ئاوێتەی مژدە هێنی یە!

بەقەدی دارا هەڵگەڕام...چڵەکانی

وەکو هەودای پرچی بووکی شعرەکانت

داهاتووەی ترۆپکی ووردەکاری یە!

ئای...کەگریشمە پەروەروتاقانایە

ئەم سروشتە...ئەوداربەژنە...ئەم

جوانی یە!

نیشتمانەو خۆشم دەوێ

شوێنێکە . . دوورِووی تیانییە

چراخانەو . . تاهەتایە

لەتۆی ڕۆمانسییەت بەخش و

ڕووگەرم و مەهۆشم دەوێ!

ئەوگۆیە زەویەی دڵەکەت

کیشوەرێکی جودایە لەوانی دیکە ..

لەوەتەی هودهودی قاسید

هۆنراوەمی بەپەنجەرەی عەرشەکەیا

ناساندووە

سولەیمانی سرتەی مێرووزانی ناخم

بە هاتنی بەڵقیسی بڕیار مێینەت

تاگەردەن نوقمی خەیاڵە و

هەردەم پێ یەوە خەریکە...!

لەهاوینی ماوەی ژینا

لەتەک ناڵەو ووشکە ئێشی

دیوی ناوەوەی برینا

لە شکاری دوبرا و باشووکەی ئەوینا

لەنسێی دارەشەکرانی تێکچڕژاوی

دڵەڕاوکێت

من شیرینە لەدارینەی ڕەنجم دەخەم!

ئاە...بۆ هەرزان فرۆشیی من

هەڵ مەکێشە

ئەگەررەزو خاوەن ڕەزیش لەسەر دانێم

ئەبێ تای تەرازووی هەنگت

بەرز دەرخەم

هەی ئاوێزەی دیوانەکەم

وەزیفەمە

دەنگت سەرخەم !!

## پێنج خشتەکی[٤]

لەســـەر پەندێــکی پــیرەمێردی شــاعیر

کـورسی و پایەو پـــووڵ نەتــفریوێنێ

بێتـــەوە یـــادت نـــەداریی دوێـــنێ

توانـــای یەزدانە چـیت بەســەر بێنێ

(دەوران دەوڵەتت لـــەدەست ئەسێنێ

بەڵام ناوی چـــاک تـــاسەر ئەمێنێ)

کە کەوتە دەستت نەخـتێ کـــارو بار

رووشـــکێن مـــەبە بەتانە و هـــاوار

گەیشتیە سەر قەل بە بازووی هـــەژار

وریـــابە دەوران نەتـــخەڵـــەتێنـــێ

هـــەر ناوی چـــاکە تاسەر ئەمـــێنێ

[٤] شالوور : ژ ٥ ، ٢٠٠٣ لا ٣٧

گەر ئازارت دی لـەدەست زۆر کـاریٚ

شـــکستت هـــێنا لــە پەلامـــاریٚ

هەمدیس بچــۆوە لای بەهـــرەداریٚ

با ئەمڕۆش دەوران جـــێت بلەقــێنێ

بەڵام نـاوی چـــاک تاسەر ئەمـــێنێ

کــە هــاتیە دنیا ڕووت بوویت و تەنـیا

لـە ترسی کـــۆشش دەروونت گـــریـا

ئیـــمڕۆت پێـــبڕا دوای هـــەزار بریا

دەوران زۆری تــر دەبـــاو دەهـــێنێ

بــەڵام نــاوی چـــاک تاســـەر ئــەمێنێ

لــــە ئاخـــاوتندا بــیر کــەرەوە بیر

کێ لە کــۆڕ دایە لەگــەنج و لـــە پیر

بە تەنـــها تۆ نیت خــاوەنی تەگــبیر

ئەوە دەورانە هــەڵــئە ســـــووڕێنێ

هــەر ناوی چـــاکــە تاســەر ئەمێنێ

ئەگـــەر لــێکەوتی ڕۆژێ لـــە ڕۆژان

بوویتە هاوڕیزی ئەشــکەنجە چــێژان

خۆتی بۆ شـــل کە وەک مردوو نێژان

(دەوران دەوڵەتت لـەدەست ئـەسێنێ

بەڵام ناوی چـــاک تاسـەر ئـەمێنێ)

## بولبول لە ئاست بێدەنگی گوڵ[٥]

٢٠٠٤/٦/٧

بۆ پەیمانەی

ئێوارە خوانی پێشوازییت

ئەسرینە کریستاڵی رۆح

ئەبارێنم

پەڕ و باڵی تەیری گول و

زەردەواڵە بوودەڵەکان

بە ئاورینگی کوورەی ناخم

ئەسوتێنم

بۆمن بەسە .. نوێژ لەگەڵ تۆ و

شەهوەتی سەمای چەند پەیوێک

وەدەست بێنم !!

---

[٥] شالوور : ژ/١٠ کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ لا ٣

مانگی تابان

تریفەی بەرائەتی رووی تۆی ناسیوە

بۆیە رووگە و دەزگیرانی دڵدارانە

هەناسەی ئارامی بەیان

ئارامیی پڕ ئیلهامی چاوتی بینیوە

بۆیە دەمی ژوانی پاکی

پەیوەندی نێوان یەزدان و

دێوانە و تەمادارانە

لێم روون نییە لە کەیەوە

گۆشەی دڵت هەوارمە

لەو ساتەوەی

خەییامی هۆشت مەست کردووم

شالووری شەیدای دەروونم دەنوک بازیی

لەگەڵ ئەنگوستی فریشتەی

جوانییت ئەکا

پڕ بە شمشاڵی گەرووی خۆی

ئەچریکێنێ

بووکی خەواڵووی چاوەڕێت

ئەپژێنێ .

ئەی شاپەڕیی هەستەوەرم

خۆگرتن و بێ وەڵامییت

شەوێکی دەیجوور و کپە ..

ئەموەستێنێ .

تەلەسمێکی زۆر ئاڵۆزە

ئاراستەی ڕەوتی ژیانم ئەشێوێنێ .

کزە هوڕەیەکی وشکە

درەختی چڕی تەمەنم

ئەهەژێنێ .

پۆپ و چڵ و گوڵ و دڵی ئەوەرێنێ . . .

بەڵام گیانە

رەگی ژینیشم هەڵکەنی

هەر بزەت خۆش ...

شەهدی بێگەردی ئەوینت

هەزار هێندەی دیکە دێنێ ..

# رازی گوڵە حاجیلەکان

٢٠٠٧/٢/١٧

خەڵفی بەژنی سەر لە هەوری شکۆفەکان

لەبەر سنگ گرتنی زریان

بە چۆکهێنانی رەشەبا .. پەشیمانن

ئەوان .. خۆیان وا ئەبینن

مسک و بۆنی گوڵە باخن

هاوتەمەنی پوورە هەنگی

بەرهەم نایابی سەر شاخن

پەند و وێردی هەمیشەیی و

باڵۆرەی بەرخەوانانن

بۆ فەرهەنگی نازنازەکان

هێمان .. شانازیین .. دیرۆکن ..

وەکو داری بۆن نەگۆڕاوی کنێرن

بۆ ناو هەڕەمەکانی شار .. بەڵاجەوین

لە هەموو کوردەوارییا خاوەن ماڵ و

لە ژوانی بەینەتدارییا

نەخشە هەڵگر و شارەزان

وەک چەهچەهەی حەسەن زیرەک

کەڕوو نەگرتوون .. لە فەزان !.

بەڵام حەیفێ ..

چەپک چەپک

لە دەلاقەی وێرانەکانا ژاکاون

لەناو تۆزی فەرامۆشیی و

قاقا گاڵتە ئامێزەکان

هەر هەندەیە نەخنکاون !!!.

## خــــەونــــی لاوێـــک [٦]

گـــەر دەتـــەوێ ئاییـــندەی خـــەباتـــم بـــی
گوڵەســـتێرەو سەهـــەنـــگ و ســـاباتم بـــی
پـەڵـــەی حـــەزێ بـــۆ کـــێڵگەم ببـارێـــنە
گـــەردی فـــیز و لاف لـــێدان بـــتەکـــێنە

گـــەر دەتـــەوێ بـــابـەتـــی دەروونـــم بـــی
هـەیـــڤە شـــەو و شـــاگوڵی ئـــەزموونم بـــی
بـــۆ تاوێکـــیش بـــە تەنـــیا جـــێم مـەهـــێڵە
تـــۆم لەگـــەڵ بـــی . . بێ بـاکم لـە رەهـــێڵە

گـــەر دەتـــەوێ هەنـووکـــەو هەناســـەم بـــی
دەزگـــیران و خـــۆشەویـــست و تـــاسەم بـــی
لـــە کـــردەی بـــێ بـــەزەییـــانە وازبـــێنە
هـەنـــگی چـــەم و کـــرنژیـــن مـەوەســـتێنە

[٦] شالوور ژ/١٧ تشرینی دووەمی ٢٠٠٧

گەر دەتەوێ حەبیبەی دیوانم بی
وەکو سرش بێ روخسەت میوانم بی
دەستت بێنەو هاوسەرانە ڕێبگرین
بە نۆشینی پەیمانەی ئەوین بمرین

گەردەتەوێ کوڕە لاوی ماڵت بم
گوێڕایەڵ و یوسفی خەیاڵت بم
بە هەرێمی دڵەکەت بمگەڕێنە
نامۆتر لە نامۆیی مەمدوێنە

گەر دەتەوێ خونچەچنی دەمت بم
خەییامی خەمنۆشی پیاڵەی خەمت بم
لە ئێوارە ژوان نەکەی دابڕاو بی
گیانە دەبێ هەمیشە دڵ دۆڕاو بی

گـــەر دەتـــەوێ بـــمەوێی تـــا پەرســـتن
پـــەنـــا بێـــنم بـــۆ کـــەناری مـــێ ویســـتن
بـــازەنوێری دڵـــداریـــمان ڕەنگـــین کـــەین
ئـاقـــاری وەفـــاداریـــمان پـــەرژین کـــەین

گـــەر دەتـــەوێ ئێشکـــچیی خەرمـــانت بـــم
وەرزێرێـــکی خۆبەخشـــی هـــەرمـــانت بـــم
فـــەرشی سـایەت راخـــە بـــۆ ناڵـــەی شـــەوم
ئـــەوە خـــوایە .. بەڵـــکو بێـــتە دیـــی خـــەوم

# خۆشەویستی
# لەگەڵ تەمەن گەورە دەبێ[7]

درەخت ..هەتا باڵاترو

ساڵانی تەمەن بژمێرێ

کارتەی ناسکتر دەر ئەکا

لەسەریەتی بسەلمێنێ

مەودای ژینی نووحیشی بێ

پێویستە بەپێوە بژیێ.

هەر بە پێوەش دوا هەناسەی سۆزوئەوین

بەڕەشە بای وێڵ

ئەسپێرێ...!

زەریا..تا قووڵتر هەڵکەوێ

[7] گۆڤاری شەقلاوە : ژ/١ ، ٢٠٠٤

زەریاوانی لەخۆ بووردەودێوانەتری پێدەوێ.

هاتنەکایەی مرۆڤ وایە

بۆهەر ڕازێ..هەرنادیارێ

چەندین پرسیاری سکپڕی لێ دەبارێ.

زەریا بۆخۆی  دنێیەکی بەڵاجەوی وپڕ خولیایە

پەی بردن بەهەرزانست و سەختییەکیش

لەدەسپێکی فێربوونی ئەلف و بێ دایە...!

سەرە ژنی شۆخ و سەماخ :

قاییم وبەرزی وەک و شاخ

تەقەللامە .. بەوردە هەنگاوی هێمن

هەموارکەم زەنوێری ناو بێرکمی سنگت

ببمە یاخەری هەمیشە بۆچەمەنی تەژیی گوڵت

ڕام کەم ئاسکی سەرنجی ترساو و سڵت!.

ڕەشبەڵەکی چاوچاوانێی پەیوی بزێو

دوورلەچاوان بسازێنین.

کەوشەنی ئەستەم و دەگمەن ببەزێنین .

بەرەو نەعیمی فەراهەم

دەرگا کڵۆم دراوەکان

بترازێنین...!

ئەوجەستە یەی.. بەسەراب ناوی ئەهێنی

فریشتەی خۆشەویستییێکی گەورەیە

بۆناو دارستانی دیمت .. بەرێوەیە

دەنگدانەوەی چریکەیەکی نێرانەی عومر چاردە و

ئاوەز پەنجای لەگەڵدایە.

شۆڕە داری بەرهەمداری پێگەیشتووت

بە ئەسپایی ئەجولێنێ

نەبا گەڵای بۆن مێینەی ژەنگ هەڵێناو

لەتەک ئەشکی بێ ئومێدیی هەڵوەرێنێ.

ئای لەو دڵە پێکراوەی من.. بەناڵەیی

باژێڕی سڕبووی دڵداریی ئەورووژێنێ..!

لەئاستی پەیمانەی لێواو لێوی خەمت

جگەر سۆزو شەشدانگ مەستم

وەی کەپێوەی گەشەدەکاو .. ئۆقرە ناگرێ

پەپوولەی لێوی هەڵبەستم..!

خانمە شێخی هۆنینەوەی هزرەکانم :

من لەتەکیەی چۆڵ و بێ ئەڵقەی زیکرتا

دەروێشێ دەست لەسەر دەستم!.

# پەیامێکی تێنوو[8]

لەکـەناری دەریـای حوسـنت لەنگـەر دەگـرم
لــە داوێنــی دونــدی پایەتســەنگەر دەگــرم
ســینەم دەخمــەی رازەکانتەهــەتا دەمــرم
ژیـــــنم هیچـــــە بـــــێ تـــــۆی دەلال
بـێ تـۆی شـالوولی زۆزان وشـەنگ و شـەپاڵ
* * *
خــەییامم و . . بـادە نۆشـی لێـوانی تـۆم
وەک مـام هـێمن ، گۆشەگیریسـێوانی تـۆم
ئافرێنــەر و تــەرەم ئەمشــەومێوانی تــۆم
ئـــاخر تاکـــــەی بتلێمــــــەوە !
بـا لــە دوورگــەی چـاوانی تۆبتوێمــەوە .
* * *
کاکە مـەمم ، چاوگـەی خـەمم شـەیدای مـەمم
بــێ بــاکم پەروانــە ئاساســووتووی شــەمم
مــن فــەرهادم ، بـێ مـرادم تەمـەن کـەمم
لـــە جێـــی زیـــن و شـــەم و شـــیرین
هــەتا مــاوین بـۆم ببـە بـەخۆشـاوی ژیـن .

---

[8] گۆڤاری شەتڵاوە : ژ /٢، ٢٠١٠

بـــۆ بەرۆكـــی بـــاڵای تەمەن شـــاگوڵم بە
بـــۆ دەروونـــی سروشـــت پەروەر ســـونبولم بە
بەچەهـــچەهەی ئـــۆقرە بەخـــش بولبـــولم بە
پەری و خـــــــــاتوونی مـــــــــاڵم بە
ئەخـــتەری بەرزو بە زریـــوەی ســـاماڵم بە.

* * *

هەنـــگ وهێـــزی وشـــە بەگـــوێم بچـــرپێنە
شـــریتی لێـــك ئاشـــكرابوون بقـــرتێنە
حەزی تـــاراوم لەئـــاگۆش بخەوێـــنە
حـــــــۆری وڤینۆســـــــی ڤیـــــــنم بە
كـــــۆڵەكەی دیـــــن و هەتـــــوانیبرینم بە.

* * *

بـا خەڵـوەتگەی ئەم ژوانەمـان تەم ڕەوێـن بـێ
شـەوق وتینـی یەكویسـتنمان شـەوبەزێن بـێ
مـــوچركەی ئـــاوێتە بوونمانـــدڵتەزێن بـــێ
وەرە گیـــــــــــــــانە دادوەرم بە
دایەنـــی كـــۆرپەی ســـەرنج و یـــاوەرم بە.

* * *

کرمـــی تـــانەی کـــۆمەڵ بـــووە بەمـــۆرانە
ســـــەماخیی و خۆپاریزییمــــــان لەتـــــۆرانە
یـــانەی لاویـــی خەریـــکە . . بێـــبە وێـــرانە
چـــــۆنی پێــــت خۆشـــــە گۆشـــــم کە
بەعەتـری هەناسـەی گەرمـت سەرخۆشـم کە

-١٩٩٤

## گومان[٩]

بەرخۆڵەیەکی نەرمۆڵەی هەستەوەرە و

لە هەرکەوی هەدا بەخش و

گەرمی دەنگم . . ئەخواتەوە ...

ئەخواتەوە و دارماڵ بەنجی

رەنگەکانی تابلۆی رەنجی

گەنجییم ئەبێ ...

پەنجەرەی ژوورەکەی فەدی

بۆ یەکەمجار ئەکاتەوەو

پێشوازیی تیرۆژی تاوی

دیەی واژەکانم ئەکا ...

خۆی ئاوێتەی هێڵە پەرێشانەکانی

گیانم ئەکا ... !

* * *

[٩] گۆڤاری شەقلاوە ژ/١٠

گومان ئەکەم ، خۆشی نەوێم

گەرچی بە ویستی من ئەدوێ...

بۆ کام گوڵخانە رێ ئەگرم

ئەو لەسەر عەرشێکە لەوێ ..

هەوای سەمای ئەندێشەیە

لە ئەوینخانەما ئەڕوێ ...

گەزۆی زەردەی پاکیزەیە

لەژانە دڵما ئەچۆڕێ

پەری و خەونێکی گەورەیە

بۆ راموسانی سۆزکردن

جار بەجارێ ، لێم ئە گۆڕێ !!.

تەمی گومان دایپۆشیوم

گەرچی وەکو شالووری ئازاد و هۆگر

لانەی دەمم جێ ناهێڵێ ...

بارانی نوێ کەرەوەیە

بەرفی ریش و مووەکانم ئەشۆرێتێ ...

هەسارەیەکی تازەیە

لە بۆشایی ئاواتم درەوشاوەیە ...

کانیژەی چارەی کۆڤانە

لە زۆزانی خێڵەسات پەروەری بەهرەم

چوار سێ مانگە گەشاوەیە ...

فریشتەی هەرسی نەهێڵ و

هەناسەی ژوانی هوومایی نەپساوەیە!.

# ئاهەنگی یەکتر ناسین [10]

٢٠٠٤/٤/١٦

دەست پێکردنێکی قەشەنگ

لە جۆزەردانێکی درەنگ

هەنگاوی دوومەلی حەزی

قاڵبووی ئیشقە

بۆ خۆ تەڕکردن لە زەریای

ڕۆمانێکی ئەویندارییی پەمەیی ڕەنگ!.

کە وێکی ڕاو

لە بناری سەفینەوە

قاسپە قاسپی حەیرانێکی بەرزی چیایی

ئاوێتەی نەرمە خوێندنی

کوکوختییێکی بێ ناز و

[10] شالوور : ئاب ٢٠٠٧ ل ٣

دەستەمۆی شاریی کردووە!.

ئێوارەیەک

لەسەر سەرە بڵندەکەی قەڵاتەوە

دوو هەناسەی پڕاو پڕی خۆشەویستیی

ئەگۆڕنەوە!.

چ گەردی بێ مرادییان لە دڵدایە

بە هەڵدانی پەیمانەی بەیەک گەیشتن

ئەشۆرنەوە!.

ئەوان .. دوو هاودەمی مەستن

بەڵام وریا و هەستەوەرن

لە چاوبڕکێ و گمە گمی

کۆترە رەنگاو ڕەنگەکانی

دارستانەکەی محەتتە و

باخی گڵکەند و منارە .. ئاگادارن!.

کۆڵان کۆڵان

گەڕەکە دێرینەکانی

عارەب و خانەقا و تەعجیل

بە مام شێخەڵڵا ئەسپێرن!.

بە دەوری دار گوڵەباخ و

کەنار گۆمی پارکی هەولێر

چاو بۆ هێلینێ ئەگێرن!.

جۆخینی دەردە تەنیایی

بە یەکەوە و بەدڵنیایی

بە بادەکەن!!

قەیرە രامووسانی گەرم

گەرم و هێمن . . تێکەڵ شنەی

شەوبا دەکەن !!.

ئەگلەنجەی شادمانی‌یە و

چەندین سرتە و زەردەخەنە

ئاوێزانی سەما دەکەن !!.

## ڕێچکە یەک [11]

١٩٧٨/٣/١٣

خۆشەویستم :

کە دەمبینی بەداماویی

وامەزانە کە تۆراوم ..

دوای بەسەرچوونی تەمەنێک

لە هیچ شۆخێ نە ئاڵاوم !.

وەکو فەرهاد

لەسەر پەیمانی خۆم ماوم

وەک دێوانە

بە ئیشقی شەمێ سووتاوم

وەهاش تێ مەگە بگۆڕێم

نە گۆڕاوم !.

چونکە بە گیراوەی خەستی

[11] شاتان لا/

پەیوەکانت گۆش کراوم

لە ناو دەریای خوێناوییدا

لە بەهرەی خوا پێداوییدا

هەر ئەوەتە نەخنکاوم ... !

لە سەرە رێی چوار کۆڵاندا

حە پەساوم ...

لە دیار بەگژ یەکداچوونی

سەرخۆش و مەست و گێلەکان

سەر سورماوم ...

من بەو هۆیەوە تاساوم

لای خەڵک گێژی تەواوم !.

وزەی ویستم:

دەپرسی .. رەنگم بۆ زەردە

یان دڵم تاوێرە بەردە..

تۆوی کۆششی خۆماڵیی

لە کێڵگە بەجێماوەکان بچێنمەوە

سەری بێقل بڵندەکان

لەئاست ئەسرینی قەتیسی

نێرگزە ناز کوژاوەکان .. دابێنمەوە!.

شیرینەکەی کوردەواریی :

گوریسی بەرهەمی رەنجت

خاوبۆتەوە ..

بە ئاوازی

((بادەست لەناو دەست کەین هەموو))

تەشیی رستنی جارانت

سەمادەکا و دەخولێتەوە ..

گەرووی ماندووت

هەناسەی ئومێد نەبڕاوت

تۆوی کۆششی خۆماڵیی

لە کێڵگە بەجێماوەکان بچێنمەوە

سەری بێڤل بڵندەکان

لەئاست ئەسرینی قەتیسی

نێرگزە ناز کوژاوەکان .. دابێنمەوە!.

شیرینەکەی کوردەواریی :

گوریسی بەرهەمی رەنجت

خاوبۆتەوە ..

بە ئاوازی

((بادەست لەناو دەست کەین هەموو))

تەشیی رستنی جارانت

سەمادەکا و دەخولێتەوە ..

گەرووی ماندووت

هەناسەی ئومێد نەبڕاوت

وا سترانی

((ئەی یار ئەی یار رۆیی یارم))

بۆ قەیرەکانی دەڤەرم دەڵێتەوە!.

ئارخەیانم هەتا هەبییت

خۆری هیوا

لەنێوان دوو برۆکانت هەڵدێتەوە

ئیدی هەوری نەزۆک پێشی ناگرێتەوە!.

پڕشنگی ئەستێرەی چەمت

تینی هەنگاوی ئەوینە و

جۆششی کۆڕی سەرمەستان

کارا ئەکا ...

زەردەخەنەی نەیار کوژت

هێزی یەکلاکەرەوەیە و

بەردەوامی بەکاروان و

چرا ئەدا ..!.

## یادی نەورۆز [12]

١٩٧٧/٣/١٥

چـۆن بولـبول بۆگوڵ ئاواز ئەخوێنێ

دایک کــۆرپەی دڵ بەنــاز ئەنوێنێ

چۆن دیمەنی جوان مایەی ئەندێشە

برین بێ هەتوان سەرچـاوەی ئێشە

چـۆن نالەباریی هــەست ئەبزوێنێ

نامـــەی دڵـــداریی لاو ئــەتەزێنێ

چـــۆن ئاگــر ئاسن ئەتـــوێنێتەوە

ئاو .. گــیا .. لەمـــردن ئەژیێنێتەوە

[12] شاعیرانی شەقلاوە : لا/١٢٥ ، ٢٠٠٨

بەهارمان زستان قاو دەداتەوە

گەزیزەی کوێستان چاو دەکاتەوە

نێرگزو شەوبا پەیام ئەنێرن

دەهۆڵ و زوڕنا داوەت ئەگێرن

منیش بەخەندێک ئازاو ئەویندار

دەڕوێنم هەندێک نەمام و گوڵزار

کوڕگەلی دڵسۆز بەیادی نەورۆز

جەژنتان پیرۆز نەورۆز و پیرۆز

## نامە هۆزانێک [١٣]

٢٠١٠/٩/٣

گوڵەستێرەی شەوگارم . . سۆز :

تۆ کە ئەوەندە شیرینی

زۆر شرینتر ژ نەبات و هەنگڤینی

بامن تووشی شەکرەڤیانی ڤینت بم!.

تۆ بەتوانەوەی دڵی من ئاسودە بیت

بامن بەهزرو گیانەوە

مەست و بەردەی خانمی پێکەنینت بم!.

هەوری قەدەر

ئاهەنگی یەکتر ناسینی ئێمەی سازکرد

مەلی باڵشکاوی وشە و

نازکوژراوی حەزی ئێمەی

---

[١٣] گۆڤاری شەتلاوە : ژ/٦ ، ٢٠١٠ لا ٤٣

لە بێرکمی ویژدانی خەوتوو دەرباز کرد.

من کەسێکی هەست ناسک و

بە ندەی جوانییم

جەسەن زیرەکی تاراوی خۆشەویستیی و

سۆزی گەرمی ناو گۆرانیم ...

بە ئازادیی ئەفرێندرام

بە ئازادییش دەبمە دیلی ئارەزووی تۆ!.

لەو ساتەوەی تۆم ناسیوە

گەرچی سەروی بەژن وبالاتم نەدیوە

نمە بارانی موحیببەت

رەزو باخی ڕەنگاوڕەنگی

تەمەنی منی تەنیوە!.

لە ناخەوە خۆشم دەوێ ی

تۆ شاپەریی تازەی منی

بۆ هەرلایەک هەنگاو ئەنێم

بەرلە گەیشتنم لەوێ ی!.

تۆگوڵە زەردی مەتین و

منیش قاسپەی کەوی سەفین

من مەمی کەوشەن بەزێن و

تۆ خاتوو زین!.

من هەمیشە میوانی تۆم

لە بیابانی سەرسامییدا

حەیرانی تۆم!.

وەلێ گوڵم : دڵنیانیم

لەکام گۆشەی خەونە کانی

دڵت ئە ژیم .

## سروشتی ئەوین [١٤]

گوڵ هەرچەندی

بەملوانکەو پەرچەمی باخ بشنێتەوە

چەهچەهەی شمشاڵی گەروی

مەلی شەیدا

سۆزی هەناو هەژێنتر ئەهۆنێتەوە.....

ئەها گوڵم .. ئەرک و خەمی

ساڵەهای لێک دوور کەوتنەوە

نەیتوانیوە ، چرکە ساتە ڕۆمانسیەکان

لە لەوحی بیرەوەریمان..بسرێتەوە!.

ئەگەر بویتە بوکی ڕاستەقینەی هزرم

دڵنییابە .. دەبیتە ئاوێزەیەکی

ناوێزەی دیوانی شیعرم...

---

[١٤] گۆڤاری شەقڵاوە : ژ/٥ ٢٠١٠ لا ٣٦

بۆیە هەتا جوانپەروەریی شێتم ئەکا

مۆگانی چاوگەی ئەوینت

وێردخانەمە

جۆشی ئامێزو پەیڤینت

گەشەو شادیی ڕۆژانەمە!

* * *

دەمێ شەوبای

هەناسەی ئەوینداریی دێ

بە دەربەندی گۆنی هێمنی درەختا

تێپەر ئەبێ،

بۆ شالوورە چاوەڕێکان

وەرزی جوولەو ئەفراندنە.

کاری شۆخە شێخە شکۆفە زیباکان

نوقڵانەی مەهن بەخشین و

عەتری ئیلهام باراندنە...

مێشە هەنگی هەستی هەستەوەران ئەڕواو

شیلەی دەمی گوڵە مێخەکەکان ئەمژێ

لە خۆشیی ژوانی سروشتی ئەندێشەیی

نمەی ڕۆندک وخوناوی

دەیان بەستەو هۆزانی ئاودار ئەپڕژێ!.

تۆ دیل و شای شانشینی ژینگەی منی

ئەزانی چەند خۆشم دەوێ ی؟.

تەنکە تارای سەر ڕوخساری تابلۆکانم :

هەر گراوی و پزیشکی برینگەی منی

تا ئەو دیوی گیرۆدەیی

خۆشم دەوێ ی .

## پرسیاری هەست

٢٠١٣/٣/١٣

ئەگەر مەلــێ هــۆگری لانــەی دەمــت بــوو
دەم و نــادەم هاوبەشی خۆشیی و خەمـت بــوو
بەعـــــەزرەتی داربــــەژنی شێوەکەمـــــت بـــوو
بـــاڵوەریوی پەرژینــی دەوری چەمــت بـــوو
چۆن دەیخەیتە نــاو کــارێزی بەزە و سـۆزت ؟
چۆن دەی بەیتە ناو گێژەڵووکەی گەردۆزت؟

## تراوکە خەونی شاعیرێک

١٢ /٩ /٢٠٠٤

وای بۆ ناچێ

لە دەڤەری ئەوینی شەم

نامۆ نەبێ ...

لە تاریکایی پشت پەردەی نادییاری

تەمینی شەم

نغرۆ نەبێ ...

سەفەر ئەکا بێ ئاگای ئەو

هەنگاو ئەنێ

تا دواکەوشەنی نیگای ئەو

وەک نەزانێ

ئەو دۆزیەتی .. ئەو هەستیەتی

خەییامی ئاوەز مەستیەتی .

هەر کوێ بڕوا لەگەڵیەتی

لە ووردەمووی لاملی لێی نزیکترە

بیرۆکەی ناو داڵغەیەتی .. لە دڵیەتی

وەک ئۆکسجین تێکەڵیەتی .

لە زۆزانە فێنکەکانی وڵاتی شەم

هەمیشە هاتوچۆیەتی

بۆشی نییە خونچە ماچێک

بقرتێنێ ...

وەک دێوانە و پەرکەمداران

یان ئەکەوێ .. یان هەمیشە

قامکەکانی خۆی ئەدوێنێ .

هەر قەدەرێ

هاوسەرانە بکەونە ڕێ

کەروێشکەکان لەخەو ناکا

بەرخۆڵەکان ناترسێنێ .

یانەی وشەی جوان تێک نادا

پەپوولەی خەندەی زەردەپەڕ

ناتۆرێنی ...

گوڵشەنی خانمی گوڵەندام

بێ گوڵ ناکا ...

نەبا گوڵە نازنازێکی وەرزی نازی

(( شەمی شەوان )) بژاکێنێ ...

وە یان جارێک .. خوانەکردە

کوزووی دڵە وەسواسەکەی

بەبێ ویستی خۆی بشکێنێ .

شەم .. بۆ کەمکردنەوەی خەمی

خەییامی خەمزەدەی سەردەم

دایکە .. دایەنە .. یاوەرە

ئەوایە .. میوان پەروەرە .

گەرمە .. هێلینە .. ئامێزە

نەرمە .. ئارامە .. بەهێزە .

لە مێ قەشەنگتر .. ڤینۆسە

لە هایدە زوڵاڵ ئاهەنگتر

بەزەیە .. بەخشینە .. سۆزە ...

ووزە و گیانی یەکترین و

شەمی هاو ڕەفتاری پەریی

لە تراویلکە سەرابتر

تەونە خەونێکی ئاڵۆزە .

## جوانپەرستیی

٢٠٠٦/١٢/١

لە توێ ی روونی روومەتی گوڵ

ئامیانی گەوهەری ئەوین

هاتە کەنین.

ئەی ئاوێزە ناوێزەکەم:

نەوای پێوەناڵینەکەت

مێشەهەنگی هەستی مەستم

لە مەستیی رائەچڵەکێنێ.

لەو شەوەی کە

شەیتانی هۆزانەکانت

کردە مەیمانی ناوەختم

من مەدهۆشم.

لەو دەمەی کە

شەرابی دەگمەنی چەمت

ئارەقی سەبری رژاندم

تا کەوشەنی هەرزەکاریی

من سەرخۆشم .

هەی ناسکتر لە ناسکیی تازەگەڵا :

هەودای ئاوریشمی هەوپەیوین

لە لێواری جۆگەلەی سۆز

ئاودیو مەکە ...

تۆ لە رووخانەی دڕکاویی

رێی سەفەری بێنەوایان

نە ڕێزانی ...

گەرچی ئاسۆی بەهرەمەندان

زۆر لە فەزا بەرینترە

بەڵام گیانە :

لە مەملەکەتی دڵی من بچێتە دەر

بە شاری مەیلی هیچ پیاوێ

گوزەر مەکە ...

لەگەڵ منی قاڵبوو نەبێ

بۆ هیچ لایێ سەفەر مەکە .

# جووڵەی ناخ

٢٠٠٨/١١/٢٨

مەلی دڵم

لە سووچێکی باخی مەیلت

خەریکی هێللانەیەکە ...

بەڵام گوڵم:

تەلاری خەون و ئایندە

بۆ ئێمە وێرانەیەکە ...

زۆرم نۆشی

لە شەرابی غەدری یاران

کەچی هێشتا

کەوی ملەی دەروونی من

لە نۆژوانی ئاوێتە بوون

ئارەزووی پەیمانەیەکە ...

خەجی بەختم

لە ئەوینگەی روونتر لە مانگ

ئەخواتەوە و هەر تینووە ...

خەمی سەختم

لە دوندی شیرینی هەڵگورد

سەخت و باڵاتر هەڵچووە ...

زۆرم کێشا

رەنج و گەنجییم لەسەر دانا

تا بە ئێستاش

زاوای تەمەنی دڵدارییم

چێژی یەکەم دیتنەوەی خۆی

لەگەڵ تۆ .. لەبیر نەچووە .

## چارەنووسی نادیار

١٥ / ١٢ / ٢٠٠١

پەری نەبووی

خەونی دەوری منالّییمت

هێنایە دیی .

پەپوولە نیت

شنۆی نەرمی خۆشەویستییت

نەهەنگی گیانی جوولاندووم .

سووتێنەر نیت

پڕیشکی چەخماخەی سۆزت

رۆژانێکە دایگیرساندووم .

تۆ شاتان و شەنگەبیێکی شەقڵاوەی

بۆ بارینی سۆزو بەزەیی

سەرچاوەی .

مەلێکی ئیلان شێواوی و

دەرکەی مەیلی یانەی دڵمت کردۆتەوە

دڵ تەنابە .. پێت ناوەتە

هێمنترین ئادی نشین

بێخەمترین وار و هۆبەی

ئێش و برین .

*** ***

ئەی ئاسمانی روونی هزرم :

شەونمی هەوری مێینەی هۆنینەوە و پەخشکردن

مەخۆرەوە

تا یاخەری ئەفراندن و پەندی تازە

چاو تێبڕینی مۆتەکەی دەردە کۆمەڵ

لەژێر پێمان ئەتاسێنێ ...

خێوی دەهۆڵکوتی عەیبەی

بێوەژنیی و بێوەمێردیی

لەئاسۆی سەرنجی دوورمان ..

ئەتۆرێنێ .

گەندەمووی روخساری شەختەی لێکدانەوە

ئەوەرێنێ .

ئەوسا .. لاوێکی خەمسار بووم

توورەبوونم لا نامۆبوو

تا لەژوانی گەورەبوونا

پەیکانی چرۆی زۆر تورەی خەڵفە نەوشە

لەدەوری دمدمی دڵما

رام بوو .. و فێری گفتوگۆ بوو .

*** ***

هەرکە دوو مەست و دوو سەربەست

دوو ئومێد و دوو تیشکە چاو

کوڕی شەو و دۆتی هەتاو

بوونەوە یەک بڕندەی ڕەگی خەمۆکیی ،

کاروان کوژەی هەبوونی تۆ

لە بوونەوەری ئەوینی خودایی من

ئەزریوێتێ ...

حەمەدۆکی ماندووی ویستم

لە مەزرای پەمۆی مەبەستت

بابایەکی شارەزایە و

لەگەڵ سەیرانی خەملیوی سرکی هەستت

نێرە و مێیەی باڕە هۆنراوە پێکدێنێ .

ئاخۆ لەپی گەورەی قەدەر

چ درەختێکی قەدەغەی خۆشەویستیی

لەهەرێمەکەی ئەزموونگەی نیوەچلی

هەڵواسراومان بخەملێنێ .

# چەکەرەی کۆرپە حەزێک

١٩٩٤

درەختی خۆشویستییمان

واخەریکە بەرهەم بێنێ

باڵندەی حەز

بەحەوت زمانان لەباخی

خولیامان وانە ئەخوێنێ

دەبێ کەڤیی لێکدانەوە

لەبەر تینی

یەکویستنمان هەرەس بێنێ .

کە دەکەویە جامی چەمم

دێتە سەما

دڵی سەماخ و تێر خەمم

پێی وایە هێشتا نەپژاوی

خونچەیەکی نەشەمزاوی

هەرچەندە ساڵانێکیشە

لەتەنیایی دابڕاوی .

بەگشت مانا خۆشمویستووی

لە گەرمەی چۆرتم و ژانا

(پێڵوی چەمم بۆ راخستووی)

گیانەکەم رابردوو تاڵە ..

لەم جارەوە

کە من قەلەندەری تۆم و

پێت گەیشتووم

لە نێو هەستە زیندوەکانت

بمشارەوە .

# حەوت گوڵە ئەڤین

١٩٩٥/ ٤ / ٢٤

- ١ -

لەسەر لووتکەی

هەرە باڵای خۆشەویستییت

بانگی خۆشەویستیی ئەکەم .

لەچاوگەی هێز و تواناوە

زۆر هەست بە تۆ ویستیی ئەکەم .

لەناو دوورگەی

بەهەشتەکانی ئارەزووت

من حەساوەی سایەی کوختی

ئەوینی تۆم .

حەووای بێگەردم .. هەوری ناز :

هەرچەندە ئەزموندارێکی

شاران دیوم

بەڵام لە تەکیە و بارەگای

پڕ دەروێشت

مریدێکی دڵتەزیوم .

کە تۆم نەبی بێ هاوسەرم

بێ هاودەمم .. بێ هاوخەمم

هەی حەووای ئاورنگی سۆزم

من هەتیوم .

- ٢ -

لێم روون نی یە .. بۆ من نابیت

بۆیە نیگا و دەست بزێوییم

بێ بەرنامە و ئاشقانەیە

چونکە ئازاری و شێرپەنجەی

خۆشەویستییت شێتانەیە .

لە بازاڕی ئاشقاندا

کوانێ نرخ و کەوشەن هەیە .

شیعر ئاهووی بەربەیانە

دوگمەی سینەی خەونەکانت

ئەترازێنێ ...

تریفەی بزە لە مانگی

تەم داگرتووت ئەنەخشێنێ

بوتی و وشکبووی رۆژگارت

وە کەروێشکەسەما دێنێ

دەمدەمەش خەم و گریانە

پەریی خۆشییت ئەتاسێنێ .

وەک رۆژگاری هەرزەکاریی

وەکو ئازاری دڵداریی

خۆشم دەوێی .

- ٣ -

بێ دەنگیت و

بەزم و شادییم قەتیسماوی

مێرگی چەمێ خوناوییتە .

هەندێ جاریش فریشتەیت و

بە پەپوولەی حەز و تاسە

تەرمی مەیلی رەق هەڵاتوم

دادەپۆشی .

لەو دەمانەی

وەژوور کەوتی لە چاوانم

خۆت خزاندە .. گۆشەی گەرمی

مینای دڵی بێ تاوانم .

بوویتە خوێن و بیرکردنەوە

لە ناخ را بۆ ناو دەماخم

کشایتە سەر.

بوویتە ڕەزم و ژینگەی شیعر و

لەدەمی خەمهەڵوەرێنم

هاتیتە دەر .

وەکو خوێن و بیرکردنەوە

خۆشم دەوێی .

ـ ٤ ـ

من لەدایکبووی برینم

گوێ ڕاهاتووی

کۆڕی شەپۆڕ و گرینم .

پەروەردەی باخ و بێستانی

شەمامکە و گوڵی ئەوینم .

گەر شیرین بیت .. دەیان بێستون

به قوڵنگی خۆزگه و ئاوات

دەکەمە زیارەتگای وڵات .

خاتوو زین بیت

زیندانی ئەبەدیی خواستت

ئارامگەمە .

من بەقەتارێک ئیشقەوە

شۆڕەلاسی پێشمەرگەمە .

شاعیر .. پەیکەری جوانکاریی

لەتنۆکە ئەسری ستەم

دائەتاشێ .

کۆرپە هۆزانی چاوسەوز

ئەکاتە گۆریی شەوباشێ .

وەک ئازادیی و خەبات و ژین

خۆشم دەوێی .

- ٥ -

خۆشاوی گوان

بێداریی سانەوەکوژی

نیوە شەوان .

خۆشەویستیی بەخشینەوە .

دێوەزمەی قین راوە دوونان

ئیلهامی هەڵبەست و هەڵوێست ..

بەرهەمی خۆش ، داری بەردار

پیاوی تێرهۆش .. مرۆی دەخوەر ..

کابانی ماڵ .. فێرگەی ئاکار

هەوێنی چیرۆک و حەیران ..

دەست و دانی گرێ کوێران ..

دایکایەتیی .. کارگەی مرۆڤ .

بەخششی تۆ بن بە خولیا ..

سیمای دروستی تۆ دەرخەن .

بێ تۆ نابم وەک ماسی و ئاو

وەکو بونەوەر و هەتاو

خۆشم دەوێی

وەکو هیوا و ووردە هەنگاو!.

-٦-

نەڵێت دیارە

کارە کۆرپەی خۆشەویستییم

فەراژیی کەی

نە لەدۆزەخی تەنیایی بەجێم دێڵی .

دڵ لە دڵدان

دڵ خواردنی بەدواوەیە

تریقەی تۆ

بۆ ڕاچەنینی هەستی من

سەرچاوەیە .

کوانێ لە جێگەی چەم و دەم

لەززەتی حەز

لە شەڕاب و پەیمانەیە .

خۆشەویستیی

بۆ جوامێریی و بەرخودان و

گیانبەخشکردن ..فێرگەیە .

وەکو هەوری خەفەت رابوون ..

وەک پێشمەرگە

لەسەرکەوتن بەزاوابوون

خۆشم دەوێ .

- ٧ -

تەمام وایە

ببمە خوێن و لە شادەماری جەستەتا

هەرێمی ئارامی دڵت

شارەزابم .

ببمە خەونی سەوز و سوور و

نەخشەی ئومێدت بکێشم .

ببمە ئادەمی ماندووی ڕۆژ

نیعمەتی یەکتر دیتنەوەت

پێ بنۆشم .

هەرکات حەزرەتت عەزرەتی

دەست لەملانێم ئەبزوێنێ

منی لە کانیی خۆشاوی ڤین هەڵێنراو

دەبمە دەزگیرانی هەتاو .

گەر بتەوێ

خۆشەویستییت لە دڵ دەرکەم

فریشتەی پاکیزەی نیازم

لەوەش پتر سەوداسەرکەم

تۆش دەست بەرداری هەناسە و

نان و ئاو بە .

# خۆشەویستی

١٩٨٢

شەوی یەڵدا چەند درێژە

زیاتریش لەو درێژاییە بەدووترابێم

کێوی سەفین چەندە لێژە

زیاتریش لەو لێژاییە گلار بکرێم

پەشیمانیی لە رووی زەردم

دەرناکەوێ

چونکە هێندەی چاوەکانم

خۆشتم دەوێ .

## دڵ تەنگیی

٥ / ٩ / ١٩٧٥

شـــەیدای شـــۆخ و نـــازدارێکم
دڵســـــۆزی خـــــونچە زارێکـــــم
زوبـــــان گیـــــراو و بێـــــدەنگم
شـــێتی کوێســـــتانە وارێکـــــم
مەیـــــنەتە گۆڕیــــویە رەنگـــــم
بەنـــدی پەرچەمـــی یـــارێکم
جەرگبـــــــڕاو و دڵـــــــتەنگم
ئـــــاواڵی دڵ ئـــــــاودارێکم
ســـینەم هەگـــبەی نهێنـــی یە
گـــوێ هەڵخســـتەی هـــاوارێکم
چـــــوارلام ســــــوپای پەژارەیە
نێچیـــــری بەردەم مـــــارێکم
لەلایەنـــــــی خۆشەویســــــتیی
وەک هەر گەنجـــێ دڵـــدارێکم
ســـــۆزم بەســـــەر هۆشـــــم زاڵە
لاوی مەمـــــــک هەنـــــــارێکم

نـــاحەز لە هـــونەر بێبەشـــە
مـــن هەڵگـــری خەروارێکـــم
ئەو خـــوێنی مـــن شـــاباش دەکـا
منـــیش تـــۆزاویی و ژارێکـــم
باڵەخـــانەی بـــۆ قـــووت ئەکەم
کەچیـــی لەلای ئەو لارێکـــم
چـــاوبڕکێی خەبـــات هانـــدەرمە
هێشـــتا پێـــی وایە خـــوارێکم
زانـــا و مەلا و دکتـــۆر نەمـــا
بـــۆلای نەبەم هـــــاوارێکم
لەگۆشـــەی مەیخـــانە زێتـــر
ئیمـــڕۆ نەمـــاوە چـــارێکم
بـــۆیە وا دێـــوانە و گێـــژم
سەرســـــامی لەنجەولارێکـــم
بەشـــم تـــاڵیی و تفتیـــی ژیـــنە
ڕاگـــرتەی ســـەر لێوارێکـــم . .

# دڵ

١٥ / ١ /١٩٩٣

دڵـــێ ئەگەر یـــار نەیشـــکاندبێ
گەردشـــی ڕۆژگـــار نەیڕەتانـــدبێ
زەبـــری بەرخـــودان نەیچەمانـــدبێ
هەڵــــڵاو هەوا دان نەیچەقانـــدبێ
لە جەســتەی مــرۆ جێــی نــابێتەوە
زوو لای مــن و تــۆ بیــرئەچێتەوە .
* * *

دڵــێ پەیمــانەی دەســتی یــار نەبــێ
ســۆفی و دێــوانەی بەینەتــدار نەبــێ
دەســتگیری پــاک و تەمــادار نەبــێ
لە ژوان لاوچــاک و هەرزەکــار نەبــێ
ئەوینـــی وڵات نـــاچێتە نـــاوی
بڵێســـەی خەبـــات نـــابێتە تـــاوی .
* * *

دڵــێ سەرخۆشــی بــزەو هەنــگ نەبــێ
مۆســیقا نۆشــی پــڕ ئاهەنــگ نەبــێ
مەکــۆی بەهــاری رەنگاوڕەنــگ نەبــێ
بەنــدەی نۆیــاری شــۆخ و شــەنگ نەبێ
مەتەرێـــزی جەنــگ نــابێتە مــاڵی
پێشــمەرگەی چەلەنــگ نــابتە ئــاواڵی .

* * *

دڵـــێ نەبێـــتە چلچـــرای یـــاران
وەک مەل نەچێـــتە شـــاخ و نـــزاران
نەگـــری بەیـــادی کـــۆنە هەواران
نەگـــــاتە دادی پـــــاڵەو هەژاران
چـــۆن گـــڕی نەورۆز گەرمـــی دادێنـــێ
لەخەوی ئـــاڵۆز چـــاوی هەڵـــدێنێ .

* * *

دڵـــێ بـــۆ ئەویـــن نەتـــوابێتەوە
لەمێرگـــۆڵەی ژیـــن نەڕوابێـــتەوە
بەبـــزەی زێـــڕین نەلـــوابێتەوە
دژی دێـــوی قـــین نەســـوابێتەوە
نـاوی مەنێ دڵ هەر گۆشتی خـاوە بۆسـەر
خـــوانی گـــوڵ جـــارێ نەکـــوڵاوە .

* * *

دڵــێ ناســک بــێ وەک لێــوی پیــاڵە
یــان کــار ئاســک بــێ لەم یــاڵەو یــاڵە
گۆشـــــــکراوی خەم لەیەکەم نــــــاڵە
داپۆشـــــــراوی تەم بە رژد و نـــــواڵە
لەم دڵەدا قـــین بیـــانیی و نـــامۆیە
یوســفی بەخشــین تیــای خــانە خــۆیە .
* * *

دڵـــێ گەر دڵ بـــێ بە مانـــای تەواو
ئـــاودێری گـــوڵ بـــێ .. بەرهەمـــی گـــوڵاو
وەک کەو باڵبەســـت و لە بێـــرکم کـــراو
شەشـدانگ سەرمەسـت و کـێس لێهێنـدراو
بەیەک جـــوولەی یـــار بـــێ چـــاوەڕوانی
دەبـــێ وەکـــو تـــار بێـــژێ گـــۆرانی .
* * *

دڵێ گەر فێزی سۆزو راستیی بێ
قەڵاو ئامێزی جوانپەرستیی بێ
نمونەی بەرزی خۆنەویستیی بێ
بەرماڵی فەرزی خۆشەویستیی بێ
کۆرپەی چاوکەژاڵ پاکی یەزدانیی
لەبەر پێی شەماڵ دەکا قوربانیی.

* * *

دڵێ گەر بڕوا چارەی ژانی بێ
تروسکەی هیوا سەر کاروانی بێ
ئارامیی ئەییوب ئاو و نانی بێ
ئومێدی یەعقوب وزەی گیانی بێ
ئەو دڵە بێ وەی ئەمێنێتەوە
هەتا ئەو رۆژەی سەر ئەنێتەوە . .

## دەنگی چوارەم

١٩٩٤

من بە ڕەنگیکی زەردەوە

بە دڵێکی پڕ لە خۆزگەو

کۆمەڵێک ئاهی سەردەوە

هاتووم بێژم : دەست هەڵگرن ...

قەتاری درۆ و خۆویستیی

هەر لەم وێستگەیە راگرن .

*** ***

دەک کانیاوی

مێشکی سرِتان کۆر بێتەوە

کە لە حەزیای سکتان زێتر

مارمێلکەیەک تێرئاو ناکا ...

دەک رەشەبا

هەوری چڵکنتان راماڵێ

لە کێڵگەی سینەتان زێتر

پارچەی دێمی قڵیشاوی

کەسێکی دی بەراو ناکا .

*** ***

هۆ .. بەرپرسان :

کوا وادەتان بۆ سەروەران

لە کوێن .. ئەو نازپەروەرانەی

بۆ گیانی ئێوە چەپەر بوون ...

بۆ شادیی و گریانی ئێوە

ئاهەنگ و بزە و تەتەر بوون .

بۆ ناو گلێنەی دوژمنان

تیر و ئەستری و نەشتەر بوون ...

کوانن .. ئەوانەی هەمیشە

لە تەکتان بوون ...

وەکو فیشەکی چەکتان بوون

لەدوا پلەی نائوومێدیی

ژیلەی خەبات و چرا بوون .

*** ***

دەمی ئاوڕدانەوەیە

ساتەوەختی برابوون و

لەیەکتر پێچانەوەیە ...

بازاڕ گەرمان

هەرسەرێکە و دەبڕێتەوە

نووسینی سەر کێلە بەفرن

هەردەمێکە و دەسڕێتەوە

لەنتەریی بێ سووتەمەنین

دەکوژێتەوە .

*** ***

من پێشمەرگەم
دەنگی هەقی ئەو میللەتەم
کێوی رەقی
ئەو نیشتمانە لەت لەتەم ...
سەنگەرەکان
گەواهیی دەری بوێریی و گیانبازیمن .
پەیمانەکان
سەلمێنەری ئاشتی و ئازادیخوازیمن .
پشوو دان و لەمپەرتەخت کردنەکان
فەرهەنگۆک و بنەنای لەکار زانیمن
ئاژانسەکان
پەیامهێنەری خەمخۆریی بارزانیمن .

*** ***

خۆ هەر دڵبەستەکەی دوێنێم
سەرمەستەکەی شێخوەسان و

باڵیسان و تووتمە و زێنێم ...

هێشتا برینم بە سۆیە

دەماخم بۆ نەخشە دانان

هەر مەکۆیە .

نەزان و نەخوێندەواران

سن و کیسەڵەی داهاتن

شێرپەنجەی گەل و وڵاتن

هەتا لەتێ نانمان ماوە

چارە بکرێن ...

لە چاوگەی فەرمانگێڕیی دا

وەلا بدرێن .

پرسیارە و دێ ...

دیتراوە قەت .. ( وشتر و خەت ؟

گورگ شوانی بەرخۆڵان بێ ؟

ڕێوی ڕێدانەری کۆتر و ڕیشۆڵان بێ ؟

گۆشت ئەسپاردەی گوربە بکرێ ؟

با نان بدرێ بە نانەوا

ئەگەر نیوەش بۆ خۆی ببا ).

# ڕاپەڕین

٢٠٠٩/٣/١

پۆڵای ئارەزووی نەیاران

بە شریخەی

ماچی تفەنگی پێشمەرگە

نەیما بەرگە .. تووایەوە ...

ژەهرە قاقای شادیی مژی

هەرزە بیران

وەک نەبووبێ ، پووکایەوە ...

پوورە هەنگی رقی پیرۆز

هاتە جۆش و

مەزرای گەوجیی و تێکچڕژاوی

فیرعەونەکان

وشکی کرد و ئاسەواری سڕایەوە !.

پیرەشەوەی خەندەکوژی

ڕێی زین و مەم

بارگە و بنەی پێچایەوە ...

بۆناو کەللە تنووکەکان

گەڕایەوە !.

*** ***

من شۆڕشی دەیان ملوێن

چاو نێرگزی کورد زووانم .

تا .. سێبەشەکەی دی جەستەم

ووزەی شەللاخی زیندان بێ

ناکرێ و بۆم نییە ڕاوەستم ...

ئاسمانی ماندوو نەبوونم

خۆشەویستیی ئەبارێنێ ...

گوڵەباخی

نەتەوەیی بوون ئەڕوێنێ .

کە سوڵتانی چەوسانەوەش

دەماری کێڵگەم لەت لەت کا ..

شەست و یەکە و .. چەک بەدەستم

وەک مام هێمن

وەکو هەژار شەرەفکەندیی

هەرەس دێنم بەجەللاد و

هەزاران تیری گورگپێک

دەکەمە تیرۆژی هەستم .

*** ***

من سێڵاوم .. ئەگەر هەستام

هەر درەختێک

ڕەگی هەڵچوون و تەڕپۆشیی

تێکەڵ ئەسرینی گۆنی کوێستانەوار و

زامی ئەنفالی گەرمێنەوار نەبووبێ

لەگەڵ خۆما ڕای ئەماڵم ...

من هاڵاوم .. کەتاوم دا

سووتێنەری بێ جیاکاریی

گڕکە تاڵم !.

خۆم لە فەرهەنگ نامۆ بکرێم

لەنەمانی هەست مردوانیش

بێ خەیاڵم !.

*** ***

من هەناسەی ئاونگی سەر

نەرمە گیای بژوێنەکانم ...

بزە و ئوومێد و خودانی

مەتەرێزی بەرخۆدانم .

هەتوانی جەزرەبەبڕی

پۆرگەکانم .

پێوە ناڵین و شەو نزای

هەتیوانم .

کزەی ناخی تەنیا باڵ و

رەنگ لە روخسار پەڕیوانم .

دەنگ زوڵاڵ و پارتیزانە

جەربەزەکەی کوردستانم ...

چایەچی داد پرسخانەی

مەلا مستەفای بارزانم !.

## ژوانی شەوبا

٢٠٠٢/٢/١٤

پەڵە هەورێک .. بەئاسمانی

نیشتمانی جەنجاڵی دڵی کەژێکا

گوزەر ئەکا ...

بە سرتەیێ .. بە زەردەیێ .. بە هێمایێ

بە ماچێکی خۆشەویستیی کەژی پتەو

نمەی بارینی چارەی وەی

ئاوێتەی دەشت و دەر ئەکا ...

هەزار نەفرەتی یەکجاریی

لە دێوەزمەی کەسەر ئەکا ...

سوێسنەو مێلاق و نێرگزی شلک و بۆرژیو

لە ژوانگەی چاوەڕوانییا .. بە بزەوە

سەر دەر ئەکا .

وشکەساڵی ئەوینی ئەویندارانە

قەڵشی کێڵگەی بەرهەمهێن و

لێوی هەوکردووی کانیاوی حەیاتی باخ

وەک سۆتەکی جگەرەیێ

گەردیلەیەکی گەردوونی فەرامۆشە .

گەر هەنگاوی هاتنەپێشەوەی کەژ نەبێ

هەوری ئاشنا بە تیشکی خۆر

دا بەزیو بۆ دەمی لووتکە

جەستەی پەروانەی خۆکوژی

بەر پێی مۆمێکی خامۆشە .

لە تەک باخ و کەژ و کانیاو

نوقمی خەوێکی بێ پرخەو کپ و خۆشە .

مەل و سروشت لە مشووری

تەدارەکی نەورۆزێکا

لە ناو یەکتری وون بوون و

زریوەیان بەرەو ئەزەلیەت هەڵکشا .

ئیتر مەلی پشوو درێژ .. لە هێلانەی

خۆزگەکانی خۆی راکشا .

کات .. شەوێکی هێمن و ئەندێشەییە

شەوبا میوانی ئەگریجەی درەختێکەو

پوورە هەنگی هزرەکانی ئەورووژێنێ

کەچی ترسی سێڵاوی گڕکانە حەزێک

ئەم سروشتەی بەهەشتی مەل ئەلەرزێنێ

ئای .. بۆ شەوبای ئاگای حاڵان

چ بەختێکە ، خۆی ئەنوێنێ .

## سووتـان بە ژیلەمۆی ئەوین

١٦ / ٦ /٢٠٠٧

مەل بە هۆگریی پەرچەمی شۆڕی درەخت

دیلی خۆشەویستیی ئەبێ

بۆ هاو تەرازووی مەجازی سۆزەی سروشت

فێری ئاهەنگی چەهچەهە و

گیانبازی سەربەستیی ئەبێ .

چەندە دڵخۆشە ئەو دەمەی

بۆ گوڵەباخێ ئەخوێنێ

زێتر سەرخۆشە بەو خەمەی

لەناو بێرکمی بێ رەحمێک دائەمێنێ.

ئەی شکۆفەی تێنوو بە خوێن :

نەکەی بێژی پەژیوانم

لە هەڵدانی

پیاڵە شەرابی دڵداریی ...

با دیمت دەرنەهاوێژێ

بزەی دەسکرد و بێزاریی.

ژیلەی هەستی لەکەمینت

پنجەگیای هەدای دەروونم نەسووتێنێ.

بۆ گرەوی زۆرانبازیی سەردانان

لە گەمەی ئەوین .. ئەمجولێنێ.

دەنگت کەوشەنەکان ئەبڕێ و

قووڵایی زەریای هۆزانم زوڵاڵ ئەکا

کەچی جەستەی تراوکەییت

مێرگی رەنگینی کۆششم لەناو ئەبا.

مەمی سەردەمی خۆم نەبم

چیم گەرەکە لە خەونێکی

زینە خانی هەیبەت سوڵتان.

فەرهادی کێوهەڵکەن نەبم

چۆن دەگەمە شانشینی

ژوانگەی شیرینی باواجی.

گەر یاخەری میهرەبانییت بوەستێنی

هەوری هەواڵگەیێنەری وشەی تازەم

ئەگرییێنی.

چاو لە ڕێگەی مەهنی نێرگزی دیدەنییت

پاتەرانییم خەڵات ئەکا

ئەی شاپەریی ئەفسانەیی چنارۆک و

حەمامۆکی بەهرەی حاجی.

## ســـۆز

١٩٩٤

ئیشقی ئێمە با بچێتە هەموو ماڵێک

ببێتە گۆرانی دەمی هەموو کوڕ و کیژ و کاڵێک

با ئیشقی ئێمە کلیلـــی

زەردەخەنەی گوڵڕەنگان بێ

ڕێگا نیشاندەری هەستی دڵسەنگان بێ

با من و تۆ قوربانی ئاخی وارێ بین

ئەویندارێ سەرۆکی بێ

باب و داکی کۆرپەیێ بین

هیویدارێ دادۆکی بێ

چونکە ئەوین لەدڵی گشت هەژارێکا

خانە خۆیـــە

بەڵێ ئەوین زمانی تێکگەیشتنی

من و تۆیـــە .

## سەفەر

٢٠٠٧/١٠/٢١

لە نەوای ناڵینی شەوی فەرهادەکەی

بێ هەواڵە ...

هەرچەندە خۆی هەڵقرچاوی

ژیلەی خەمە .

وەرزی وەنەوشەیی عومری کاڵ بۆتەوە

بێ بەش لە دەستاڕهێرانێ و

چێژی هەرزەیی و دەسگەمە .

سەر هەڵئەگرم بۆ بێستوونی ئەفسانەیی

خواستەکانی ...

یان شەودێزی دژەخەوی دڵ ئەکەمە

نێچیری دڕندەی مەرگ

یان لە دەستی شیرینە هاو خەفەتەکەم

وەر دەگرم پیاڵە خۆشاوی زیندەگانی .

## شەقڵاوە

٢٠١٢/٥/١

شارۆچکەیێ

هەڵکەوتە وەک مێرگی بەهەشت

لەبارترین هەواری ئەندێشەیی گەشت

ساکار وەکو کیژی لادێ

سازگار وەکو کانیاوی زەلاڵی لاڕێ ! .

شارۆچکەیێ

لەفەرهەنگی ژیانی من هێندەی شارێ

هێندەی هەرێمێ . . . وڵاتێ . . .

لەشیرینی ، جێیەکی دیکە نایگاتێ

خورپەی خۆشەویستیی و ئەوین

هۆی دامرکانەوەی جۆشی

دڵی هەڵبڕاو و خەمین .

شارۆچکەی زێدی نەوشەی من

پڕسۆرگوڵ و وەنەوشەی من .. شەقڵاوەیە ..

چوارسێ مانگە مەیلگەرم و ڕازاوەیە !

لە کەژاوە دڵڕفێنەکەی کوێستانە

بووژێنەرەوەی دەروون و

بووکی جوانی کوردستانە .

## فرمێسکی شیرین

٢٠٠٤

وەک چەپکە مووی
سەربڵاوی پرچی خاوت
سەربڵاو و پەرێشانم ..
وەکو سەودای پڕ عەزرەتی
جوولەی چاوت
بۆ ژوانگەیەکی پرتووکاو
گرینۆک و دڵ بەژانم .

بە گڕەماچێکی وێڵی خورپەی دڵت
گۆمی مەنگ و ئاسۆڕەنگ و
چاوگەی هەنگ و پڕ ئاهەنگی
تاساو وەکو سەرنجی خۆم
ئەشڵەقێنم ..

هەوری پێشگرتووی ئەستێرەی

بەختەورییت

بەسەر سەفینی سەرکەشی

بێ ویژدانیی .. ئەبارێنم .

لەجێگەی هەر خۆزگەیەکی

فەرامۆش و

هەر خەندەیەکی خامۆشت

دەیان خەونی نوێبوونەوەت

وەدیی دێنم .

لە میحرابی چاوەکانتا هەڵکورماوم

وێردی پەیوەندیی ئەخوێنم ..

خۆ هەرنەبێ چەند چرکەیێ

لەتوێی دڵۆپە ئەسرێکی پیاوانەدا

تابلۆی رەزی مەیلەو ژەڵمی

بێ خاوەنت .. ئەنەخشێنم .

پەروانەی شەکەتی رۆحم

لە ئەگلەنجەی پڕ گریشمەی

هیوا تیشک زێڕینەکەت

ئەسووتێنم .

ئازارێکی ئۆخەی هێن و بە لەزەتە

مێشەهەنگی هەوڵەکانم

لەنۆشین و هەڵمژینی

شیلەی شکۆفەی لێوانی

ویستە هەڵواسراوەکانت

بفەوتێنم.

## گڕوگاڵێک

۲۴ / ۹ / ۱۹۷۹ هەولێر

دوورم لە لاوان چـــونکە بـــێ یـــارم
شـــکۆفیانەوەی کـــزی بەهـــارم
هەڵاڵە و بەیبـــوون ، نێرگـــز و چنـــوور
شـــلێر و مـــێلاق ، بـــۆنی گوڵەســـوور
لە گمەگمـــی کـــۆتری ناومـــاڵان
لەگردبـــوونەوەی بەچـــکە کەژاڵان
خەنـدەی پـڕ هەنگـی ئیلهـامی ناسـک
لەشـــلکەی ران و بازنـــد وباســـک .
دوورم لە رێـگەی فەرهـادزادەی چـین
لە هەڵکەنـدنی بێسـتون بـۆ شـیرین
هەناسـە و چـپەی وشـەی پـڕ تـاوت
بـــووکی پێـــدزەی تـــرپەی هەنگـــاوت
لەســـینە و گۆنـــا و دیەی نەخشـــینت
لە بەشـــداربوونی مـــانگی هەنگوینـــت
ژیربـــوون و ســـۆز و هەســـتی نهێنییـــت
نەشـئەی بێـداریی و مەسـتیی شـەوێنیت

دوورم لەبەژن و بـــاڵای لاولاوت
رۆژانـــی جەژن و بەزمـــی تەواوت
شـــنە و شـــێداریی شـــەماڵی شـــاخم
تاقـــانە یـــاری ئـــاوات و داخـــم
ئـــازادیی بـــووکی دزراوی شـــارم
تەواو تێربـــوونی گەلـــی هەژارم
لەقـــامکی نەرم و نـــوڵی خـــامەدار
کۆمەڵگـــایەکی زانســـت پـــایەدار

*** ***

نـــزیکم لەوەی دڵ و زوانـــی
یەکبـــێ لەو دەمەی دەڵـــێ گـــۆرانی
وەڕێ دەکەوێ بـــۆ ئەو دیـــو زوهـــرا
لە ژووری تـــارم هەڵـــدەکا چـــرا
بە ئـــارەق رشـــتن ، بەگەرووی وشـــکی
دەژیێنـــێ دایکـــی ، هەم بـــرا و خوشـــکی
لەو تێکۆشـــەرەی راســـتیی گـــوم نەکـــات
لەتەنگانەیـــا هـــیچ خـــۆی دوا نەخـــات .
نـــزیکم لەوەی پێـــی بـــێ پـــێڵاوە
لەئەســـپی شـــۆڕش بەجـــێ نەمـــاوە

بـــاوکێ کە چەنـــد جـــار پشـــتی شـــکاوە
لەخەوی شـــــیرین بێـــــبەش کــــراوە
لەچـــــۆپیی کێشـــان هاوســـــەری خەمە
هیـــوا و ئـــازادیی وێـــردی ســـەردەمە
تامـــاوە ســـــنگی داڵـــــدە و ســـەنگەرە
بـــــۆ پاراســـــتنی چـــــووزەی چەکەرە .
نـــزیکم لەوەی بـــێ ئەســـرین رشـــتن
زاڵە بـــــۆ رازی دەروون هەڵڕشـــــتن
بە رۆژ تەتەرە و شــــــەو تابەیـــــانی
بە ( ئەی شـەهیدان ) گۆش دەدا گیـانی .

* * *

دووریـــــی و نزیکیـــــی دژێتـــــی یەکـــن
تفەنـــگ و قەڵەم وەکـــو یەک چەکـــن
یەک گیانن دوو لەش لەدەست هەڵمەتبەر
پـــێکەوە گیـــانی زۆردار دێنــــنە دەر .

# گریانی خۆش

٢٠١٢/١/١٥

کە ئەنگوستت نا بە زەنگی دەری هەستم

لە سڵای کوێستانی مێشکم

هاتووچۆتە ...

بەخێربێی بۆ نیشتمانی

کۆچەریی پەروەری پاکم

یانەی خۆتە ...

ئەی نایابترین گەشتیاری

ئەم وەرزەی ڤین .. گوڵەباخێک

رەنگو بۆتە .

وەرە .. بەفری مووەکانم

ئاوێنەی ڕاستەقینەی پانتاوی دڵمە

سڵ مەکە لێم ...

دەردی ئەوین بەئازارە

خۆشیی تێدا بەدیی دەکەم

دەست مەخە ڕێم ...

لە کامە گۆشەی ئەم شارە

ناڵەی ئەویندارێ هەڵسێ

ئەمن لەوێم .

وەرە .. بە فرمێسکی گەشی

چاوی وشە گریاوەکانی گیانی خۆم

بتشۆمەوە ...

وەرە .. لەناو پێکی خەمی

ئەم شەوە تەنیاییەمدا

بتوێرەوە...

بڕیاری کۆتایی منە

گەر ژەهریش بیت ، بە یەک نەفەس

بتخۆمەوە .

## مژدەی بەرە

١٩٨٨ شێخوەسان

ئیمشەو خەمێک

بۆتە قەتماغی برینی دوێنێ و پێرێم

دڵی ئاوسم ژان دەیگرێ و

کۆرپەیەکی جوان دەهێنێ

باوکم ناوی دەنێ تۆڵە .

هۆ خەڵکینە :

هۆزەبانە بەسەر دەرو

دراوسێیان دا دەبەخشم

زریکەی تۆڵەی نۆبەرەم

نەعرەتەی پێشمەرگەی گەلە و

لەخەو راستتان دەکاتەوە

ئێوەش خڕتان وەخۆکەون

کۆنەشیر و خەنجەرەکانتان دەربێنن

بەمێشکی من بیانسوونەوە

جوان جوان سەقایان کەنەوە

دیواری سینەم بشکێنن

بەچاوساغیی بیپشکنن

گەر بەرازی لەپەنا بوو

سەری ببڕن

کەلاکیشی بسووتێنن

بێشکەی بەرەی کوردستانیی

رابژێنن

نەمامی بەرەی بەرینی نیشتمانی

زوو بچێنن

دەنا موژدەم

ئاگاتە گوێی هەموو کەسێ

کە دەخنکێ .

## مەڵۆی وشە

٢٠١١/ ٣ / ٨

گەر پێت خۆشە گوڵی بەژنت

لە گوڵخانەی هەستەکانم

بلاوێنم ..

باڵی پەروانەی وشەی جوان

بەسۆزی مۆمی ژوانگەیێ

بسووتێنم ..

خونچە ماچی بەختەوەریی

لە مێرگۆڵەی دەمی نیازێ

بقرتێنم ..

فریشتەی تاراوی ئاوات

لەسەر سینەی تراویلکە

نەفەوتێنم ..

بەزە و بەخشین ببارێنە

بۆ ئارامگەی ئامێزی حەز

بمجووڵێنە .

گەر مەیلت بێ

لە لانکۆڵەی جووتە گوارەی

بووکەڵەی هۆزانەکانم

بتخەوێنم

لە دەیدیکی ئاوریشمینی

زوڵفی پەرێشانی رۆحم

بتحەوێنم

ئاوێزی دەگمەی شێوەی تۆ

لە میوانگەی پەریی هەواری ویژدانم

داگیرسێنم

هەرگیز گریە لە کۆرپەڵەی

زیت و گورجی ئیرەیی تۆ

هەڵنەستێنم ...

گوڵاوی ژێر گەردانەکەت

بە باڵای بۆچوونەکانم بپرژێنە

کەبابی تیکەی جەرگی من

لە ئێوارە سەیرانێکتا

لەسەر سکڵی ئارەزووی خۆت

ببرژێنە .

هەنسکە گۆن

ئەسرە گەوهەر بەرهەم دێنێ

ئاوێتە بوون

لەگەڵ رۆژگاری زیندەگییت

پەناگەی شەوی تەنیاییم

ئەخەملێنێ

ئەز وەگەردی

نازنازەکانی وەرزت بم

شالووری نووزەی هەناسەم

وەجۆش دێنێ .

تۆ خەریکە

ئاسمانی من داگیر دەکەی

بەوری بێدار و جەربەزەم

لە ڕکەی پۆڵایی ویستت

زنجیر دەکەی .

لە یەکەم ووزەی هەنگاوت

بۆ دەروازەی چاوەکانم

لە مەلەوانگەی ئاوایی دەروونم دا

بوویتە زیباترین ماسی .

سات بە سات و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ

مەڵۆی چڵە خۆزگەکانم بوونە خەرمان

تا ژێکانی تاری دەنگمان

لەرینەوە و یەکیان ناسی .

تۆ ئاوێنەی خۆشەویستیی و

کانیاوی بەر مانگە شەوی

مەگەر تەنیا ڕێبواری گیانبەخشی هونەر

بزانێ دەربڕێ باسی ...

ئەی ڤینۆسی یانەی عومر و

نەرم و هێمنی ئەوینم :

مەلی سەودام بە داوی ئەگریجەی ستەم

ڕاو نەکەیت و هەڵیواسی .

گوڵە مێخەکێک لە چڵا

ئەقرتێنن

نەخشەی سۆمای رۆحی سەدان

نازنازی ناز لێ هەڵوەریو

ئەشێوێنن

هاوار لە ناخی فریشتە و دەمی ویژدان

هەڵئەستێنن .

دەک خوایە گیان

ئەو ئەنگوستانە هەڵوەرێن

ساچمە لە شلێری بەژنی حەووا دەگرن

ئەو دڵانە بوەستێنی

هەناسەی مەریەمەکانی دەڤەرەکەم

لە ئیلهام بەخشین ڕادەگرن .

لە سروشتی ئاقاری خۆشەویستی دا

باڵندە و هەتاو و خونچە بەهاریەکان

دەستەیەکن

لەژێر رەحمەتی بارینی لێزمەی تانە

سەرمەستی ماچ گۆڕینەوە و

ئاهەنگی ناو بەستەیەکن .

بۆیە هەتاوی بیری من لاو دەمێنێ

ئاونگی دەمی مێلاقێ

تین و گیانە بۆ هۆزانم ،

پەیامی ئیشقی گیابەندە زۆزانیەکان

پێناسەیە بۆ ژیانم .

جوانترین یار لەم شارەدا

کۆڵەکەیە بۆ ئیمانم .

زەریا مەنگ و ترسناکە

بە قووڵییەوە هێمنە ...

ئەو شەپۆلە ئەفسووناویەی سەر روخساری

زادەی گونجە و نمە بارانی ئەوینە

بۆیە تاکو ئالوودەبوون رووگەی منە ...

تەرمی زوورگی خەمەکانم

ماوەیەکە لە چاڵ ناوە

مراندوومە و لە تاراوگەی دەروونیشم

هیچ پێشوونێکی نەماوە ...

ئاخر .. گەلۆ

حیساب لەگەڵ خۆشەویستا

لە کوێ باوە ؟.

# ناڵەی بێداریی ئاشقێک

١٩٩٩/٧/٣٠

خونچەی حەزم

بە هەناسە و چپەی گەرمی دەنگت نەبێ

بە خۆشاوی ئەفسووناویی هەنگت نەبێ

گەشە ناکا و ناکرێتەوە ...

گێژیی سەرم

بە مەرگی بێ مەیلییت نەبێ

تەواو نابێ و نابڕێتەوە.

گەر تۆ یاری هاودەردمی

خانزادی وڵاتی دڵمی و

پەیبەری رەنگی زەردمی

بادەی مەیی چاوەنۆڕییم

ورد و خاش کە ...

کۆرپەی هیوای تەمەنێکم

لە باوەشی پڕ عاتیفە ودلۆڤانییت

بلاوێنەوە و هەراش کە ...

گیانە و ئۆخەی و پێکەنین

تێکەڵ سڵاو و شەوباش کە.

لە یادت بم

لەو دەمانەی بە گرژینەوەی بەختیاریی

لە پێش جامی برینی من

خۆت جوان ئەکەی ...

بە ئارەقەی شەو نخوونییم

زامی قووڵی خەمەکانت هەتوان ئەکەی .

لە یادت بم

لەو دەمانەی دووپشکە زەردەی تەنیایی

بێ مەودا بێزارت ئەکا ...

لەو دەمانەی گورگە بۆرەی بۆسەی سەردەم

هەڕەشە لە کارکەژاڵی

نەپژاوی رۆژگارت ئەکا .

کە مەلی برسیی ئارەزووت

گەییە مەزرای پەمۆی نیازم

بۆ گرتنەوە و بەند کردنی

هەنگاو مەنێ

دەنا دڵی سەربڕاوت قاقا .. قاقا

پێ دەکەنێ .

لە تۆ روونە

تۆ بۆ من و من بۆ تۆ بم

مێرگی بەهەشت بۆ پاشەڕۆژی خۆزگەمان

ئامادەیە ...

مەگەر نازانی هەبوونی کۆی دەریاکان

لە فرمێسکی هەورە وێڵدا

سەرچاوەیە ؟

نغرۆ بوونم لە بیرکمی ئەوینی تۆ

لە هێلکەدانی زەمەندا

گەرای ژیانێکی تازەیە؟.

بەگەڵ خۆمدە .. چۆن لەگەڵمای

چۆن وەکو خوێن وەکو نەوشە

ئاوێتەم بووی و لە دڵمای ...

تارای بوکێنیی پەمەییت

زاوای خەیاڵی نزیکمی داپۆشیوە ...

مارە زیوی دیدارێکی عەزرەت ئامێز

شارەگی ژین و ئارامی

لێم گوشیوە .

تۆ لە ئاستی خۆشەویستییێکی گەورە

پێ نەزانی

سەرەڕۆیانە و بێ پەروا

گوزەر ئەکەی

شاجوانەکەم : چۆن ئەتوانی؟.

# وشــە گڕە

١٩٨٨/٤/١٥

هەڵەبجەم گرتە ئامێز و

کەزیەکانیم هۆنینەوە

دەستە سوور و نەرمەکانیم

تێر لستنەوە

تا .. شەکەت بووم

خۆم کوتایە دۆزی باسکە کورتەکانی .

سەرم خستە سەر دیواری

لاچەپی سینەی ئازاری و

هەموو لەشم بوو بە کوێچکە ...

ترپە ترپی دڵی گەورەی

ئارام ئارام دەهاتە گوێ و

کپ دەبۆوە ...

دەگەڵ پشووی تەنگ و سواری

نقووم دەبووە گەڵیی گیانی .

خڕە خڕی سییەکانی

لە سوارێکی تەنگاو دەچوو

لەشارێکی نەمر و زیندوو .. و

دیلێکی چاوەڕێ ی رۆژی

رەشی ، مەچەک بەستان دەچوو .

تنۆک تنۆک ...

فرمێسکی گەش و ئومێدی

بۆ سەر بەرکۆشە سەوزەکەی

دا دەباراند .

دیمەن تا دیمەن توندتر بوو

دڵتەزێن و ئەستەمتر بوو .

لەش لەرزین و لرفە لرفی

پەیکەری بەردی دەجوولاند .

دەنگی گڕ و ورەی بەرزی

ناخی زەوی و گەردوون و مرۆی

دەهەژاند ...

وتەی گەرم و هیواکانی

کە بە نەرمی دەدرکاندن :

لەماوەی سێ دەقیقە دا

پێنج هەزار دڵ لەکار وەستا

هەژدە هەزار چاوی کەژاڵ

لە رووناهیی بێبەش کرا

نۆ هەزار مرۆی کورد زمان

بە (خەردەل) و بە (سیانید)

لە پەل کەوت و خنکێندرا .

زیندوو بووم .. چاوم کۆڵدرا

ڕۆڵەکانم بە نووکی چەقۆی بلدۆزەر

بن ئاخ کرا .

ژانی هەشت هەزار بارزانییم

لە دڵ و دەروون چێندرا .

کۆشک و سەرام

بەسەر یەکتر تەپێندرا

شوێنەوارم گەسک درا

خەڵاتی بەرزی شەهیدییم

پێشکەش کرا .

هیرۆشیمای ژیاندەوە

خۆی لەناو خۆی کوڵاندەوە

بۆیێ یەکە

پەڕە لەبن خامەی دەستم

ئەزیرێنێ

وشەی نەوشە سادەکانم

خۆی بە جیهان ئەناسێنێ

کڵپەی سووری چاوی پەیڤیش

تێکەڵ گڕی تفەنگ بووە و

تەختی فاشیەت ئەسووتێنێ

لە تۆڵەی هەر تاکە زامێک

دەیان .. سەدان ئەتاسێنێ

چونکە مەرەکەبی یاخیی

لە بیری خوێن هەڵێنجاوە

بە بێ وەستان دەکرفێنێ

نە دیجلە ، نە فورات ، نە نیل

توانای نییە

ئەم گڕە دابمرکێنێ ...

## وەرامێک

١٩٨٨ شێخوەسان

هۆ کچە کورد :

دەست و پەنجە و رازەکانت

لانک ژێنی ویژدانتن ..

خۆشەویستت چەکی منە

تۆربەی شادییت لە شانمە .

ئەگەر لە درەنگە شەوێک

گوێت لە ڕمبەی ئار پی جی بوو

سەخڵەت مەبە .

خۆت کۆکەوە و هەست ڕاگرە ..

موژدەم پێیە ...

موژدەی ئەو رۆژە نزیکەی

کەوا تیایدا حەزەکانت

ئارام دەگرن .

جا ئەو کاتە

هەزاران چرای وەکو تۆ

بۆ سەرگڵکۆی منی قوربانی ئەو خاکە و

هەڤاڵانم .. کە دەبینە

مەشخەڵی فاشیزم تۆقێن ..

ببنە پێشەنگ .. ببنە دایکی

نەوەی سبەینێی نیشتمان .

کەتۆ هێندە دڵنییا بی

لە مانەوەی گڕی نەورۆز

هی پێشمەرگە و هاژەی رووبار

ئەم بڕوانامەیەت پیرۆز ...

بەڵێن بۆ تۆ و زامەکانت

بۆ سۆزی هۆزانەکانت

خۆ ڕاگربم تا بمێنم ...

هیوای روون و خواستەکانت

لەناو یەکتر نەخنکێنم .

بێ پەروابە .. هاوار بکە ...

خوشکانت ئاگادار بکە .

ئێمە بەچەک .. ئێوە بە پێنووسی گڕدار

ئێمە لەدەر ، لەشاخ ، لەدۆڵ و دەشتایی

ئێوەش لەناو تاریکایی ...

بە زۆردار رادەگەیێنین :

دەستبەستە نین .. مەتەرێزگر و بوێرین ...

پوختی پەیامی دەروونمان

بۆن کرووزی هەزاران گوڵە مێلاقی هەڵکرووزاو..

پۆستەری وێرانە و سووتاو

بۆ دادگەی ویژدان دەنێرین ...

بۆ وەچەی شەڕ دەسەلمێنین کە نامرین و نابەزین

تا گۆوەندی ئازادییمان

لە کوردەواریی دەگێڕین .

## وەرزی ئەوین

٢٠١٢/٣/٥

خۆشت نەوێم ، بەم بەهارەی

تەمەنتەوە .. هاوڕێم نابی

خۆشم نەوێی ، چۆن هەمیشە

لەگەڵ پەنگری گەشاوەی سۆزم ئەدوێی.

خۆشت نەوێم ، بە بریقە و

سەمای وشە .. شادت ناکەم

خۆشم نەوێی ، لەگەڵ جوولەی

دەمی شلێر .. چریکەی باز یادت ناکەم.

خۆشت نەوێم ، مۆمی نەوشەم

لە دەروونت .. ناتوێتەوە

خۆشم نەوێی ، خونچەی حەزت

لە نەمامگەی خەونەکانم ناڕوێتەوە.

خۆشت نەوێم ، لە ئاستمدا

هێمیی شەرم .. ناتخووسێنێ

خۆشم نەوێی ، تینی نازت

بە هێمنیی تا سەر ئێسقان

نامسووتێنێ.

خۆشت نەوێم ، لەم سەفەرە

کورتەی ژیان .. نایەیتە رێم

خۆشم نەوێی ، تاسەی ژوانت

بە هێزی رەشەبا و زریان

کارناکا لێم.

خۆشت دەوێم ، بە شێوازو

هەنگاو نانی ناوازەی خۆت

خۆشم دەوێی ، لە ناخەوە

وەکو مناڵی دوور ئاگۆش

دەگرییێم بۆت.

## ئـاڵا

٢٠٠٧/٣/١٠

بەرداخی دڵی من ببە

بۆ پەیمانەی ئەگلەنجەیێ

شەرابی هەناریی جەرگم

بکە بە سووراوی لێوی

ژوانی ئێوارە پیاسەیێ ...

بەڵام جوانێ :

تەونی جاڵجاڵۆکەی هزرم نەشێوێنی

لەوەتەی هەم .. دێوانەیی

بەچنینیەوە خەریکم ...

هەوای وڵاتی ئەندێشەم جێ نەهێڵی

سەدەهای سەدەیە تەمەو

هێزی ئەوینمان گەرەکیە

ئاڵایەکی کوردستانی لێ بچێنێ .

## ئاوێنەی هەست

٢٠١١/ ١٢/ ٣١

گیانە سڵاو ...

بێ خەوشتر لە ئاوێنە

روون و بە مەجازتر لە ئاو :

من دەمەوێ

لە بنار نزاری لاوییت

کۆختەی بەڵاجەویی ئەوین

دامەزرێنم .

لە شاخی ناوازەی ناخت

پوورە هەنگی کپی شەرم

بورووژێنم .

ڕایەخی تەڕیی شلێری

ڕازیبوونتی تیا بنوێنم .

سەروی هەڵکشاوی باڵات

بە گەرمای هاوینی تەمەن

نەڕووشێنم ...

چۆمی نهێنیەکانی بێ خشپەی چەمت

بشڵەقێنم .

شالووری سەد ئاواز خوێنی

( نازێ )ی هەستت نەڕەنجێنم .

تا هەناسە و گوڕ و تینی

کۆرپە هۆزانی بێ وێنە

وەدەست بێنم .

چونکە ئازیز :

من بە وزە و سەرە تاتکێی

خۆری بزەت لاو دەمێنم .

بۆ ئاسکۆڵەی

برسی و بزێوی وشەی وێڵ

تۆ پاراوترین بژوێنی ...

بەسەرنجی وورد و تیژت

ئاوەزی مرۆ ئەدوێنی ...

لەپی نەرمی منالانەت

لە لۆکەی دڵ ئالاندووە ...

ئاساییە

بۆ گەشە و هەنگاوی بەختت

لە رەگەوە دەری بێنی .

## ئەویندار پیر نابێ

کاکە مەمی

ئەندێشەی شاعیرێکی مەست

لە باخێکی چوارلا دڕک و تەژیی بەور

دەسماڵی چۆپی کێشانی خەونە زینی

گرتۆتە دەست ...

بەتەمایە هەرزەکارە تادارەکان

لەژوانێکی گەمەی مەرگی بە لەرزو تا

لەناو نەوای ژێر مەمکە تا گرتووەکانیان

داڵدەی دەن و بی پارێزن .

ماوە نەدەن .. قەیرە خەمی تەڵاقدراو بیدۆزنەوە ...

جارێکی تر بۆ گۆوەنی دان و داویان

بیقۆزنەوە ...

مەم دەزانێ

پەریە تورت و نەپژاوەکان

چەند بێ باکن .. چەند مەمزەدەن

چەند گورج و سەخیی ئامێزن .

ئەی مەلە رەنگاڵەکانی ئەوینداریی :

ئەی هەراشە کاڵەکانی بەینەتداریی :

چەهچەهەی شالووری هەڵبەست

زایەڵەی حەیرانی چیایی

کۆچەرە دڵ سپیەکانی

زۆزانی ئەم دەڤەرەیە و .. باڵا ئەبێ

بۆیە بەهار لە دوای بەهار

گڕنژین بەخش و دەلالتر .. خۆی رائەنێ

لەگەڵ جوولەی باڵی پەپوولەی لێوی یار

زاوایانە .. پێ ئەکەنێ .

تاڵکەی کێڵگەی بێ خاوەنی

دڵبەستە رەنگ پەڕیوەکان

لە ریشەوە هەڵئەکەنێ .

رازی باخ و گریشمەی تاڤگە روونەکان

بە ئاهووی بەرە بەیانی خۆ هەڵماڵیو

ئەگەیەنێ .

سەمفۆنیای حەزی پاکیزەی

شلێرە بێ ماکیاژەکان

بۆشکۆفە ئاسۆ گەشەکان ئەژەنێ .

ئەی گوڵە نازنازەکانی گوڵخانەکەم :

ئیمرۆی ئێوە .. دوێنێ ی منە

سبەینێتان .. ئەمرۆی منە

توخوا نەکەن

کەس بە چاوی پیر بوونەوە

هەڵە بکاو لە چاوانی من بڕوانێ

چونکە گیانە : ئەویندارم

لەکەسی پاراو بە ڤییان .. لاوتر کوانێ .

# ئەویننامە

٢٠٠٦/٦/١٨

ڕۆژانێکە

ئاورینگی ئەختەری نیگات

بۆتە ووزەو گەشەی دڵم

گوڵجاڕی مەهن ئامێزی

گەش و زیبای شێوەکەمت

مژدە ئەدا .. خودان گوڵم .

دەسا هاوبەشی تەنیاییم

هەراسی مەرگی پێکەنین

دەر بە دەرکە لە بازاڕم

لەناو سینەی ئەویندارم .

# بــاوەڕ

١٩٧٥/٤/١٧

گــەر بســـووتێم و نـــەمێنم بـــاکم نییـــە
لـــە ئـــارام و خۆگرتنـــا تـــاکم نییـــە
قـامچی[١] ڕێژیـی و فەلاقـە هـیچ نرخـی نییـە
با نـەڵێن کـورد بـۆ سـەربڕین بـەرخی نییە
گوێی پێنادەم گـەر بەشم هـەر بێ دادییە
هیـــوا دارم .. بـــاوەڕم بـــە ئازادییـــە .

## خواستی من

١٩٧٩/٩/٢٤

دڵم کیژێکی دەوێ
سادە و ساکار بێ و جوان
دەمم ماچێکی دەوێ
تەڕ بێ بەشیلەی لێوان
ڕۆڵم کەسێکی دەوێ
هاندەری بێ لە مەیدان
ژینم مامزێکی دەوێ
هەڵبەزیبێ لە کێوان
زەینم یارێکی دەوێ
ژیر بێ کاتی لێقەومان
گیانم جارێکی دەوێ
بچێژێ تامی ژیان .

# بۆ باوكم

١٩٨٢/٧/٢١

دەژیـــم و دەمـــرم لـــە پێنـــاوی تـــۆ
رێـی كۆشـش دەگـرم لەبـەر تـاوی تـۆ
لــە دنیـــای بـــوونم تـــاكو بمێـــنم
بـــەهزری روونـــم شـــادییت بـــۆ دێـــنم
تـــۆ زۆرت دیـــوە بـــابی زۆرزانـــم
منـــت بەخشـــیوە بـــە نیشـــتمانم
بـــــەڵێنم داوە منـــــیش بـــــەخاكم
تـــا هێـــزم مـــاوە بـــێ تـــرس و بـــاكم
لـــە قەســـابخانە خوێنـــاو بنۆشـــم
یـــان گرتووخانـــە تێـــك بـــدا هۆشـــم
جـــێ پـــێم نـــەمێنێ لـــە ئـــاوەدانی
ســـەگ بملاوێنـــێ لـــە چۆلـــەوانی
ناچمـە ئـەو شـوێنەی كـە تـۆ نەتـەوێ
یـان بـەر ئاوێنـەی كـە سێ تـۆی نـەوێ.

## دوو داواكاری

١٩٩١/٧/٢٦

(١)

شاعیرەكان:

پێشەنگی لەشكری ژانی هەژارەكان

خۆشم دەوێن

خۆشم دەوێن خۆشەویستیی خەییام بۆ مەی

(هەژار) بۆ كوردستانەكەی...

من شیعرێكم لێتان ئەوێ

بم جۆشێنێ

وەك زریكەی زامی كۆرپەی دایك شەهید

بم تەزێنێ..

مێشكی ژەنگاوی و خەساوم راهەژێنێ..

داری گەندەڵی بۆرژووا

لە رەگەوە هەڵتەكێنێ...

بەڵام نەكەن

شیعرم بۆمەکەن بە چیرۆک.

وشەی بەرزی مۆسیقایی و

تەژیی ویژدان

بۆهەڵبەستەو

جۆشدانی کۆڕی تێکۆشان.

(٢)

هونەرمەندان:

هۆ ئاوێنەی هەڵسوکەوتی گەلەکەتان

دەو پارێزم

دەو پارێزم، پارێزگاریی پێشمەرگە لە سەنگەرەکەی

بەهرەمەند لە بەرهەمەکەی.

پێشمەرگە بووم

وەختێ جیهانی دەماخم

بە (بەیات)ی رمبەی تۆپ و قرمژنی رەشاش

پاراو بوو...

پێشمەرگە بووم

کە (حیجاز)ی ناڵینەکەی هەڵەبجەی خۆم

خوا ناس و نەناسی گریاند...

ئێستاش هەر هەمان پێشمەرگەم

بە (دەشت) و (خاوکەر) و (قەتار)

هاودەنگتانم.

بەڵام نەکەن.. توخوا.. نەکەن

لەسەرشانۆی کرێگرتە مەقریپێنن...

گوێی کۆرپەڵە ساواکانمان

بە ئاوازی رێگە شێوێن رامەهێنن.

# ناوەخنی شیعرەکان

MINARA PRINTING PRESS
چاپخانەی منارە - هەولێر
مطبعة منارة 0750 445 6297